*** ڕۆژنامەی ( نجمة ):**

- یەکەم ژمارەی لە کەرکوک لە (١٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)، بەزمانی عەرەبی دەرچووە، لەسەرەوە نووسراوە (جريدة رسمية تصدر وتباع كل صباح في البلدة وفي سراي الحكومة)، بەڵام لەدوایدا بەزمانی تورکی دەردەچوو، کەبەم شێوەیە تاوەکو هەشت ساڵ بەردەوام بووە.
- یەکێکە لەو ڕۆژنامانەی کە ئینگلیزەکان هەوڵیان بۆ داوەو داویانەتە حکومەتی عێراقی، لەسەر ڕۆژنامەکە دەنوسرا بەناوی (نجمة كركوك)، ئەم ڕۆژنامەیە لە دواییدا ناوەکەی گۆڕا بە (کرکوك)و تا ماوەیەکی دوورو درێژ بەردەوام بووە.
- ئەم ڕۆژنامەیە لە سەرەتادا بە دوو لاپەڕە تا ژمارە (٢٤٩)، بەڵام لە دواییدا بووەتە چوار لاپەڕە لە ژمارە (٢٥٠)ەوە، بەڵام لە (٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩١٩)دا بووەتەوە دوو لاپەڕە لە ساڵی دووەمدا.
- لەم ڕۆژنامەیەدا گەلێك شاعیر وەکو ڕەفیق حلمی‌و عەبدولقادر خلوسی‌و کفریلی و هجری دەدە و حەلیم شیعریان بڵاوکردووەتەوە. لە ساڵی ١٩٢٦ ڕۆژنامەی کەرکوك جێگەی ئەم ڕۆژنامەیەی گرتەوە.
- کارگێڕی بەڕێوەبردنی گشتی ڕۆژنامەکە لەلایەن (شوکری عەبدولئەحەد)ەوە کە مامۆستای قوتابخانەی (ظفر)ی سەرەتایی بەڕێوەبردراوە، سەرنووسەر (سەعدی ئەفەندی) بووەو بەڕێوەبەری نووسینیش (ڕەشید عاکف) بووە.
- ڕۆژنامەی (نجمە) هەتا ژمارە (٢٤١)ی لە ڕۆژی (١٤) ئابی ساڵی (١٩١٩) ڕۆژانە بووە، بەڵام لە دواییدا بووە بە ڕێژەی سێ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا هەر لە ژمارە (٢٤٢)ەوە هەتا دوا ژمارەی کە بریتی بووە لە (١٢٨٢) لە ڕۆژی (١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٦).
- ئەم ڕۆژنامەیە بۆ بڵاوکردنەوەی (ئیعیلانی تاپۆ) و دائیرەکانی ترو هەندێك بەیان‌و تەبلیغاتی حکومەتی دەرئەهات، جگە لەمە وتاری کورت‌و بێفەری تورکی تیا نووسرا، لەمامۆستاکانیش بەلاوە بەدەگمەن هەل ئەکەوت کەکەسێکی تر لەڕۆژنامەدا شتێك بنووسێت.
- ڕۆژنامەیەکی حکومی قەبارە بچووك بوو، (٢٩×١١) سم بوو، کە حاکمی شاری کەرکوك (لۆنگریك) دەستی کرد بەبڵاوبوونەوەی.

*** ڕۆژنامەی ( تجدد ):**

- ڕۆژنامەیەکی هەواڵی ئەدەبییە بەزمانی تورکمانی هەفتەی جارێك لە کەرکوك دەرچووە، خاوەنەکەی (ئەحمەد مەدەنی) بووە سەرنووسەری بەڕێز (سەعدی) بووە بەڕێوەبەری بەرپرس دکتۆر (حەمدی ئاوچی) بوو.
- ژمارە یەکی لە ڕۆژی شەمە (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٠) دەرچووە ماوەیەکی کەم دەرچوو ئینجا لەدەرچوون وەستا کە تا (١١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) بەردەوام بووە.
- ئەم ڕۆژنامەیە بە چوار لاپەڕە دەرچووە بە قەبارەی (٢٠،٥×٣٢) سم لە چاپخانەی (حوادث) چاپکراوە.



*** ڕۆژنامەی ( کەرکوك ):**

- ڕۆژنامەیەکی سیاسی وێنەدارە، لەسەرەتادا بەزمانی تورکی هەفتەی دووجار، لەچوار لاپەڕەدا دەرچووە.
- یەکەم ژمارەی لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٦) بڵاوکراوەتەوە.
- ئەوەی جێگەی ئاماژەیە کەناوی ڕۆژنامەی (نجمة) گۆڕدراوە بۆ کەرکوك، ئەویش بەهۆی ئەوەی وەجدی ئەفەندی لەبەشی ئیدارەو تەحریری ڕۆژنامەی (نجمة) کاری کردووە.
- ڕۆژنامەکە لە چاپخانەی (حوادث) پاشان لەژمارە (٣٩) ەوە لەچاپخانەی شارەوانی کەرکوك لەچاپ دراوە تا دوا تەمەنی ژیانی هەمیشە لەدەزگای شارەوانی کەرکوك بووە، لەپێشدا (وەجدی ئەفەندی) کاروباری نووسین‌و بڵاوکردنەوەی تا ساڵی (١٩٢٧) گرتبووە ئەستۆ، پاشان لەژمارە (٦٦)ی ڕۆژنامەکەوە هیجری دەدەی کاکەیی سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی چاپخانەکەو دەرچووندانی ڕۆژنامەکەی دەکرد، لەدوای ئەویش جەمال یەعقوبی ئیش‌و کاری ڕۆژنامەکەی بەشێوەیەکی فەرمی تا ساڵی (١٩٥٩) بردووەتە ڕێوە، ئەوجا شاعیری کورد (عوسمان خۆشناو) کراوە بەسەرپەرشتیکەری، خۆی پێوە ماندوو کردووە، بەڵام ئەوەی شایەنی باسە لەپاش شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨) ناوی ڕۆژنامەکە گۆڕاوەو بووەتە (گاوورباغی) ئەڵێن بەسێ زمان کوردی‌و عەرەبی و تورکی دەرچووە.
- بەشە تورکییەکە بەسەرپەرشتی لەتیف بەندەر ئۆغلو


كركوك

افتتاح مجلس النواب الجديد

٥٠ طالبا للتخصص بالنفط



بووە، لەپاشان دەرچوواندنی (٣٤) ژمارە لەورۆژنامەیە لەژێر ئەو ناوە نوێیەدا دووبارە ناوە کۆنەکەی گەڕاوەتەوە دۆخی جاران واتا بووەتە کەرکوك.

– لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٢ شارەوانی لیژنەیەکی لەچەند فەرمانبەرێکی خۆی کە هەندێ شارەزاییان هەیە لەنووسین سەرپەرشتی کاروباری رۆژنامەکەیان پێکەوەناوە، ئەمانیش هەتا رۆژی (٢٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧٢) لەگەڵیدا رۆیشتن‌و ئیدی ئەستێرەی ئەو رۆژنامەیە لەئاسمانی رۆژنامەگەری کوردستاندا ئاوابوو، هەتا ئەو کاتەش (٢٠٣٣) ژمارەی لێدەرچوو.

– بەڵام لەهەندێك سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکات کە تاکۆتایی دەرچوونی (٢٠٣٦) ژمارەی لێدەرچووە.

– ئەوانەی بەشدارییان کردووە لەنووسینەوەی بەشە تورکییەکەی ئەم رۆژنامەیە لەشاعیران ئەمانەن: (هیجری دەدە، محەمەد سادق، پیرەمێرد، ئەسعەد نائب، رەشید عاکف، نازم رەفیق، خدر لوتفی کاکەیی، عومەر فەوزی، تۆفیق جەلال).

– لەنووسەران ئەمانە:–

فەهمی عەرەب، محەمەد خەتیب، عنایەت رەفیق، جەمال عیزەددین، نوری سابت (حبزبون)و چەند کەسێکی تر. لەبەشە تورکییەکەیدا زۆرجار وتارو نووسراوی بەنرخ لەبارەی مێژووی شاعیرانی کورد شێخ رەزاو خالسی‌و فائیزو هی تر بلاوکراوەتەوە کەمێژوو نووسەرەکانی ئەدەبی کورد وەکو سەرچاوەیەك دەتوانن سوودی لی ببینن.

– بەڵام دەربارەی بەشە کوردییەکەی:–

هەروەکو لەمەو پێش باسمان کرد ئەم رۆژنامەیە لە هەوەڵەوە بەزمانی تورکی دەرچووە، لەپاشان بەتایبەتی لەساڵی (١٩٣٠)وە بەشێکی تریان بەزمانی کوردی خستووەتە سەری‌و تا ساڵی ١٩٣١ بەردەوام بووە لەژمارەی (٣٠٢) دا کە رۆژی (٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٠) دەرچووە لەسەر رووپەڕەی یەکەمیدا ناونیشانەکەی خۆی بەکوردی بەم جۆرە نووسراوەتەوە:–

((همو شتیك انوسی ایستاکە کەهر رۆژان دوشمە دەردچی غزتەییکی تورکی‌و کوردیە)) لەمەدا دەرئەکەوێت کە لەو کاتەدا هەفتەی جارێك دەرئەچوو، دوا ژمارەیش کەمن بینم ژمارە ٣٧٤ بوو کە لە رۆژی (٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣١) دەرچووە.

– زۆربەی سەروتارەکانی بەشە کوردییەکەی لەسەر ووتارە تورکییەکانەوە وەرگێراونەتە سەر زمانی کوردی، هەندێك جاریش (شارەزووی) ناوێك سەر وتاری تایبەتی بەکوردی نووسیوەتەوە، هەروەها گەلی لەدەنگ‌و باسەکانی ناوخۆو دەرەوە لەگەڵ چەند وتارێکی کۆمەڵایەتی هەر لەتورکییەوە وەرگێراوەتە سەر کوردی‌و بلاوکراونەتەوە، هەر شان بەشانی ئەوانەش ناوە بەناوەیەك باس‌و خواسی کوردەواری لای خۆمان دەنگوباسی رووداوەکانی کوردستانی تورکیاو ئێرانی دەنووسییەوەو بەسۆزێکی نیشتمان پەروەرییەوە گیروگرفتەکانی گەلەکەمانی ئەخستەروو، وەکو لەژمارە (٣٢٨)دا وتارێکی زۆر دڵسۆزانەی لەبارەی هەڵواسینی



آخر خبر

قررت وزارة التربية الاشتراك في معرض اسبوع الكتاب العربي الذي تقيمه وزارة التربية المغربية في الفترة من ٢٢-٣٠/تشرين الثاني/١٩٦٤م ، وقد ارسلت الوزارة الى دائرة الملحق الثقافي للسفارة العراقية في الرباط مجموعة من الكتب والمطبوعات العراقية لأجل ايصالها الى وزارة التربية المغربية.

كركوك

جريدة اسبوعية عامة تصدرها بلدية كركوك - تأسست سنة ١٣٤٥هـ - ١٩٢٦م

العدد ١٨٢٦ | السبت ٥/٩/١٩٦٤م | ٢٨/ربيع الثاني/١٣٨٤هـ | الثمن ١٠ فلوس

اطلاق سراح الاكراد الموقوفين

في حديث السيد كامل الخطيب وزير العدل انه تم اطلاق سراح الاكراد الموقوفين بسبب حوادث الشمال ، وانه لم يبق منهم الا من كان متهماً في جرائم اخرى لا علاقة لها بهذه الحوادث.

قانون النفط الجديد

السيد المتصرف يتفقد أعمال الادارة المحلية والبلدية

متنزهات وحدائق عامة على ضفاف نهر الخاصة

اختيار مواقع لأسواق عصرية جديدة

(شێخ سەعیدی پیران) نووسیوەتەوە.

- ئەو کوردە نووسەرو شاعیرانەی کەبەشدارییان کردووە لەنووسینەوەی بەشە کوردییەکەی چی بەنووسین و چی بەشیعر ئەمانەن: (شێخ سەلام، شارەزووری، ئەحمەد موختار جاف، محەمەد زەکی، ئەحمەد کۆیە، کەرکوکی، ن.ع.ا)، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە لەنێوان بەشە کوردی و تورکییەکەیدا هەندێ جار شیعری فارسی و دەنگوباسی بەعەرەبی بڵاوئەکرایەوە مامۆستا ئەوشیروان ئاوا باسی هۆی دەرچوونی دەکات:-

((لە کەرکوك حکومەت هەفتەنامەیەکی بەتورکی لەژێر ناوی کەرکوك دەرئەکرد، تا ئەو کاتە هیچ ڕۆژنامەیەکی حکومی یا ئەهلی لە کەرکوك دەرنەچوو بوو، وەکو بەشێ لەسیاسەتی ڕازیکردنی کورد، چوار لاپەڕەی (کەرکوك) بۆ نووسینی کوردی تەرخان کرا)) ڕۆژنامەی (ژیان)یش بەبۆنەی ئەم بەشە کوردییەوە ئاوا باسی دەکات:-

((دیسانەوە بەخۆشیەوە خوێندمانەوە غەزەتەی کەرکوك کە هەتا ئێستا دوو سەحیفەی بەکوردی دەرئەچوو قەرار دراوە هەموو ڕۆژێکی دووشەمە دەرچێ و چوار سەحیفەی بە کوردی بێ بەرامبەر ئەو مژدە خۆشە میللەتەکەمان پێ‌خۆشحاڵ بوون ئومێد دەکەین ئەم برا خۆشەویستەمان هەر بەموەفەقی خدمەتی وەتەن و میللەتەکەمان بکات))

- بەڵام دەربارەی بەشە عەرەبییەکەی:-

لەساڵەکانی پەنجادا بەشێکی تری بەزمانی عەرەبی خراوەتە پاڵ بەشە تورکییەکەی و لە ساڵی (١٩٥٣)دا ژمارەی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکە زیاد کراوە و بووەتە هەشت لاپەڕە لەو سەردەمەوە تاکو شۆڕشی ساڵی (١٩٥٨) ئەم نووسەرانە لە بەشە عەرەبییەکەی هاوکارییان کردووە:- (عەباس عەزاوی، مستەفا جەواد، تۆفیق وەهبی، محەمەد بەهجەت ئەلئەسەری، مەحمود ئەلعەبتە، د. تەقیەددین ئەلهیلالی، عەبدولعەزیز ئەلجەوالی، حەمدی ئەلئەعزەمی، وەحیددین بەهائەددین، سینان سەعید، عەتا تەرزی باشی)، لەپاش شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨) ئەم نووسەرانەش لەو بەشەدا بەشدارییان کردووە:-

(موکەرەم تاڵەبانی، ئەبو عەفاف، فەلەکەدین کاکەیی، محەمەد مەلا کەریم، عوسمان خۆشناو، دلپاك جباری -جەبار جباری).

- لەسەرەتای ساڵی (١٩٦٠)وە بەشە عەرەبییەکەی تەنگی بەبەشە تورکییەکەی هەڵچنیوەو لەپاش ماوەیەکی کەم بەیەکجاری داگیری کردووەو تادوا تەمەنی هەر بەزمانی عەرەبی دەرچووە لەساڵەکانی شەستەوە ئەم ڕۆژنامەیە گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووەو نەیتوانیوە ئەو پایەو سایە پێشکەوتووەی خۆی لەڕووی تێرو تەسەلی ناوەڕۆکەکەی بپارێزێت و ئەو کۆمەڵە ئەدیبانەی کە لەمەوپێش بەنووسین هاوکارییان لەگەڵدا کردووە دەس بەرداری ئەبن و لێی ئەتەکێنەوە، بۆیە لەو ساڵانە دوایی تەمەنیدا گەیشتە ڕادەیەکی لاوازی ئەوتۆ کە لەدەوروبەرێکی تایبەتی تەسکدا بڵاوئەکرایەوەو دانەئەبەزییە کتێبخانەکان بۆ فرۆشتن چونکە خوێنەرەکانی جارانی لەدەس چوو، بۆیە ئەویش ڕەواڵەتێکی ڕەسمی ڕەق و تەقی بەخۆیەوە گرتبوو، زۆربەی لاپەڕەکانی لە چوار لاپەڕە بوون بۆ ئیعلانات و بەیاناتی ڕەسمی تەرخان کرابوو.




*** گۆڤاری ( صدى الشباب ):-**

- گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنیری بووە، کە لە ساڵی (١٩٣٢) ناوەندی (کەرکوك)ی کوڕان بە زمانی عەرەبی دەریانکردووە.
- تەنها چوار ژمارەی لێ دەرچووە.

*** ڕۆژنامەی ( ئەیلەری ):**

- ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریی بوو کە هەر دوو ڕۆژ لەهەفتەیەکدا دەرچووە بەزمانی تورکمانی بە چوار لاپەڕە.
- ژمارە یەکی لە (٢)ی ئاداری (١٩٣٥) دەرچووە.
- خاوەنی ئیمتیاز (بەکر سدقی محێدین) بووەو سەرنووسەر (عەبدولقادر خەلوسی) بووەو بەڕێوەبەری نووسین پارێزەر (ڕەشاد عارف) بووەو کە ئەندامی (مجلس السيادة) بوو لەدوای شۆڕش (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨).
- (١٧) ژمارە بەردەوام بووە لەدەرچوون، ژمارەیەك لە نووسەرو ئەدیبی وەکو دکتۆر نەسرەت فوئاد، پارێزە ڕەشاد عارفو سەعید بەسیمو محەمەد حەماسیو حامید ندیم بەشدارییان کردووە، بە هۆی بڵاوکردنەوەی بابەتی سیاسی ڕۆژنامەکە لە دەچوون وەستاوە.
- لە ژمارەکانی (١) تا (٤) لە چاپخانەی (سریان)و ژمارەکانی (٥) تا (٨) لە چاپخانەی (کرخ) چاپکراوە.




*** ڕۆژنامەی ( باسەرە ):**

- ڕۆژنامەیەکی هەفتانەبوو، کە لایەن (شاکیر فەتاحە)وە دەرهێنراوە ئەو کاتە قائیمقامی ناحیەکە بووە.
- لە ساڵی (١٩٤٢) یەکەم ژمارەی لە ڕۆژی (٢٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٢) دەرکردووە، (٢٤) ژمارەی لێدەرچووە کە دوا ژمارەی لە (٢٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٢) دەرچووە، ڕۆژنامەیەکی بەپێز بوو دەربارەی ناوچەی قادرکەرەمو ئەو ڕووداوانەی لەو ناوچەیەدا ڕوویداوە.
- ئەم ڕۆژنامەیە بە کۆپی کردنو بە دەستخەت نووسراوە لەلایەن نووسەر خۆیەوە.

*** بڵاوکراوەی ( شیلان ):**

- بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی حیزبی (هیوا) بووە لە کفری بە نەهێنی لە گوندی (زەرداو) دەردەچووە بە دوو لاپەڕەی دەسنووس، بە سەرپەرشتی (مستەفا نەریمان)و (عەتا تاڵەبانی)و (محەمەد قەرەداغی)و (محەمەد نەجیب تاڵەبانی) بڵاودەکرایەوە، لەنێوان ساڵانی (١٩٤٢-١٩٤٣) بە (تایپ) چاپ کراوە بە چوار لاپەڕە.

*** ڕۆژنامەی (چەمچەماڵ):**

– هەفتەنامەیەکی ڕۆشنبیریی گشتی بوو بە زمانی کوردی، نووسەرو ڕۆژنامەوانی بەناوبانگ (شاکر فەتاح) لە ساڵی (١٩٤٦)دا ئەو کاتەی جێنیشینی قائیمقامی چەمچەماڵ بوو دەری دەکردو هەفتەی جارێك دڵو دەروونی خەڵکی قەزاکەی پێ رووناك دەکردەوە، گەلێك زانیاری بەکەڵکی دەربارەی مێژوو زانیاری لەسەر شارەکە دەنووسی.

– ڕۆژنامەیەك بووە بە دەستخەتو کۆپی کردن نووسراوە لەلایەن نووسەرەوە.

– ژمارەی یەکی لە (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٤٦)و دوا ژمارەی لە (١٢)ی ئابی ساڵی (١٩٤٦) دەرچووە، کە حەوت ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

*** ڕۆژنامەی (دەنگی داس):**

– ئەم ڕۆژنامەیە وەکو ئۆرگانێکی حیزبی شیوعی عێراقی (قادر کەرەم) بە دە نووسخەی دەسخەت دەرچووە بەقەبارەی (١٦) لاپەرەی دەفتەری نووسینی ئەو سەردەمە لەبەر ئەوەی بڵاوکراوەکانی حیزبی شیوعی نەدەگەیشتنە ناوچەی قادر کەرەم بۆیە شیوعییەکانی قادر کەرەمی ناوچەکە، ژمارەیەکیان ناردە لای لقی کوردستانی حیزبی شیوعی پاش بڕیاردانو ڕەزامەندی لەتشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٧)ەوە تاکو ئاداری (١٩٤٩) بەردەوام بووە، سەرجەم ژمارەکان بەدەسخەتی (محێدین شێخ مەحمود) نووسراوەتەوە کەتاوەکو ئەمڕۆش لەژیاندایە.... هەر ژمارەش بە (٥٠) فلس فرۆشراوە، جاری وا هەبووە یەك ژمارە (٣) دیناری گرتووەتەوە... ئەوانەی کە بەشدارییان لەنووسینەکاندا کردووە شەهید شێخ حوسێن بەرزنجی سەرنووسەر بووە سەرووتار هی ئەم بووە، مەلا ئەحمەد مەلا کەریم، شێخ حەسەن شێخ محێدین، جەبار عەبدولکەریم ئاغای زەنگنە، تەیب شێخ سەعدون.

– زۆربەی بابەتەکانی ڕۆژنامەکە کۆمەڵایەتی بوون جگە لەبابەتێکی کەمی ڕامیاری ئەمەش لەبەر ئەوەی لەکاتی کوللەو گرانیدا بووە. زیاتر بایەخی بەلایەنی تەندروستیو ژیانی خەڵکەکە داوە، بایەخی بەئەدەبیش داوە، پاشان لەسەر داوای حیزبی شیوعی لەئاداری ١٩٤٩ گوازرایەوە بۆ ناوچەی (شارەزوور) لەڕۆژنامەیەکی تایبەتی قادرکەرەمەوە بوو بەڕۆژنامەیەکی زەمان حاڵی حیزبی شیوعی لقی کوردستان بۆیە بڕیاردار ئەو ژمارانەی بۆ قادر کەرەم دەنێردرێن بەخۆڕایی بێت چونکە ئەوان خاوەنی فەزڵن.

*** بڵاوکراوەی (ڕەنجدەر):**

– بڵاوکراوەیەکی ناوبەناو بووە بە دەستخەت نووسراوە لە ناوچەی قادر کەرەم لەلایەن حیزبی شیوعی عێراقییەوە بە (١٦) لاپەرە، لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٧) بۆ ئاداری ساڵی (١٩٤٩) بەردەوام بووە، بەسەرپەرشتی سەرنووسەر (حوسێن بەرزنجی)و بە دەستوخەتی (محێدین شێخ مەحمود قەرەچێوار).




– بەڵام دوای ماوەیەك لە ناوچەی (قادر کەرەم)ەوە گوازرایەوە بۆ ناوچەی (شارەزوور).

*** ڕۆژنامەی (الوحدة):**

– ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیو ڕۆشنبیریو ڕیکلامیی هەفتانە بووە بەزمانی عەرەبی، خاوەنەکەی (جەمال عەبدولنور)و بەڕێوەبەری نووسین (ئەلیێر قستۆ) بوو، ژمارە یەکی لە (٦)ی ئادار (١٩٤٨)، بڵاوکراوەتەوە، (٢٢) ژمارەی لێدەرچووە، لە(١٥)ی ئەیلولی ساڵ (١٩٤٨) لەدەرچوون وەستاوە.

– لە سەرەتادا لە چاپخانەی (محفوظ)و لە دواییدا لە چاپخانەی (الاتحاد) لە موسڵ چاپکراوە.

– لە سەرەتادا بارەگای ڕۆژنامەکە لە یەکێك لە ژووری ئوتێلەکانی کەرکوك بووە، بەڵام لە دواییدا گوازراوەتەوە بۆ شوێنێك لە نزیك چاپخانەی (ئەحمەد ئاغا).

*** گۆڤاری (صدى الشباب):**

– گۆڤارێکی زانستی ڕۆشنبیری بوو، خاوەنی گۆڤارەکە ناوەندی (الغربية)ی کوڕان بووە لە کەرکوك.

– سەرنووسەری مامۆستا (حوسێن عەلی ئەحمەد بەیاتی) بووە، کەمامۆستای زمانی عەرەبی بوو.

– ژمارەی یەکەمی لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٠) دەرچووەو تەنها چوار ژمارەی لێدەرچووە بە قەبارەی بچووك.

*** گۆڤاری (الاخلاص):**

– ژمارە (٢)ی (گۆڤاری صدى الشباب) بە ناوی (گۆڤاری الاخلاص)ەوە دەرچووە لەلایەن ناوەندی کەرکوکی کوڕان لە ئایاری ساڵی (١٩٥٠) بە زمانی عەرەبیو بە چوار لاپەڕە

بڵاوکراوەتەوەو لە چاپخانەی (العربية) لە بەغدا چاپ کراوە..

*** بڵاوکراوەی (عالية):**

– بڵاوکراوەیەکی تایبەتی بووە بە کۆچی دوایی (مەلیکە عالیە) دایکی مەلیك (فەیسەڵی دووەم)، بە زمانی عەرەبی لەلایەن ناوەندی (کەرکوك)ی کچان لە ساڵی (١٩٥١) بە سەرپەرشتی (کەوکەب داوود خەشاب) بە قەبارەی (٢٠) لاپەڕەو لە چاپخانەی (بغداد) چاپ کراوە.

*** ڕۆژنامەی (صدى الشمال):**

– ڕۆژنامەیەکی سیاسی هەفتانە بوو بەزمانی عەرەبی. خاوەنەکەی (مەعروف عارف) بووە.
– سەرنووسەری پارێزەر (بورهان عومەر تکریتی) بووە.
– ژمارە یەکی لە (٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٥١) لە چاپخانەی شارەوانی کەرکوك دەرچووە، دوای (١٣) ژمارە لەدەرچوون وەستاوە لە مایسی ساڵی (١٩٥١).

*** ڕۆژنامەی (ڕزگاری):**

– ڕۆژنامەیەکی ناوەندی زمانحاڵی حیزبی دیموکراتی کوردستانی بووە کە سەرنووسەرەکەی (ئیبراهیم ئەحمەد) بووە، چەند ژمارەیەکی بە زمانی کوردی بە نهێنی لێ دەرچووە لە کۆنگری (٢) لە ساڵی ١٩٥١ بە سەرپەرشتی (حەمزە عەبدوڵڵا) یەکەم ژمارەی لێ دەرچووە لە ئەیلوولی ساڵی (١٩٥١) بە چوار لاپەڕەی فولسکاب.
– ژمارە (٥)ی لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٢) دەرچووەو تا کۆنگرەی سێ لە ساڵی (١٩٥٣)و تا خولی سێیەم لە ساڵی (١٩٥٥) بەردەوان بووە.







*** گۆڤاری (الثقافة الحديثة):**

– گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتییە، کە بەدوای زانیاری ئەدەبدا دەگەڕا، بەزمانی عەرەبی لەلایەن (جمعية المعلمين) ەوە دەردەچوو، لە کەرکوك.
– یەکەم ژمارەی لە ئایاری ساڵی (١٩٥٤) دەرچووە، ژمارە (٢)ی لە تەممووزی ساڵی (١٩٥٤) دەرچووە.
– بەڕێوەبەری نووسین دادوەر (عەتا ترزی باشی) بووە.
– یارمەتیدەری مامۆستا (حوسێن عەلی داقوق) بووە.
– ئیمتیازی دەرچوونی وەستا بەپێی دەرچوونی یاسای (الجمعيات)ی ژمارە (٢٩) لە ساڵی (١٩٥٤).
– چەند کەسێك دەوریان هەبووە لە دەرهێنانیدا وەکو مامۆستا (ڕەفعەت سەعید یولو، خورشید کازم بەیاتی، محەمەد کلدان، وەحیدەدین بەهائەدین، سینان سەعید، عەباس عەزاوی، د. عەبدولجەلیل تاهیر، کەنعان سەعید).

*** ڕۆژنامەی (الآفاق):**

– ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی بوو بەزمانی عەرەبی و تورکمانی و بە هەشت لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.
– ژمارە یەکی لە (٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٥٤) دەرچووەو لە (٢٧)ی ئاداری (١٩٥٩) لەدەرچوون وەستاوە.
– خاوەنی ئیمتیاز قائمقام شاکر زیائەددین هورمزی بووە
– سەرنووسەری (سوعاد هورمزی)و پارێزەر (حیسامەددین ساڵەیی)و (عەتا تەرزی باشی) لە دەستەی نووسەران بوونە، بەڵام لەدواییدا (عەتا تەرزی باشی) لە دەستەی نووسەران دەرچووە، بەڵام (حوسامەددین ساڵەیی) هەربەردەوام بووە.

*** گۆڤاری ( مرۆڤ ):**

- گۆڤاری حیزبی دیموکراتی کوردستان بووە بە نهێنی لە کەرکوك، لە دوای کۆنگری (٣)ی حیزبەوە بڵاوکراوەتەوە.
- یەکەم ژمارەی بە زمانی کوردی لە ساڵی (١٩٥٥) دەرچووە.

*** گۆڤاری ( صدى الواعى ):**

- گۆڤارێکی نهێنی بووە بە دەستخەت نووسراوە لە قەزای خورماتوو لەلایەن (عەبدولەتیف بەندەر ئۆغلۆ) و هاوڕێکانی لە ساڵی (١٩٥٥) بڵاوکراوەتەوە.

*** بڵاوکراوەی ( صدى الشباب ):**

- بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەیی ڕۆشنبیرییە، کەخاوەنی ناوەندی (الغربية) بووە لە کەرکوك لەلایەن لیژنەی هونەرە جوانەکانی ناوەندی (الغربية) دەرچووە، سەرنووسەری مامۆستای ڕەسم (سینان سەعید) بووە.
- ژمارەی یەکەمی لە نیسانی ساڵی (١٩٥٥) دەرچووە بە زمانی عەرەبی بە قەبارەی (٣٢) لاپەڕە.
- ژمارەیەکی تری لە ئاداری ساڵی (١٩٥٧) دەرچووە، دوا ژمارەی لە ئاداری ساڵی (١٩٥٨) دەرچووە.

*** ڕۆژنامەی ( خەبات ):**

- زمانحاڵی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو، سەرەتای دەرچوونی لە کەرکوك بوو لە پاییزی ١٩٥٥.
- لەلایەن (هەمزە عەبدوڵڵا) و (جەلال تاڵەبانی) و (خورشید شێرە)وە سەرپەرشتی کراوە.
- بە نهێنی لە گەڕەکی شۆڕیجە دەرچووە.







- بە ڕۆنیۆ بە چوار لاپەڕەی (A٤) چاپ کراوە، بەڵام ژمارەیەکی تری لە زستانی ساڵی (١٩٥٥)دا بە شەش لاپەڕەی (A٤) چاپ کراوە.

*** ڕۆژنامەی ( خەباتی کوردستانی - نضال كردستان ):**

- ڕۆژنامەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی یەکگرتوو بووە، بە نهێنی بە (١٢) لاپەڕە لە کەرکوك لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٧) بە چاپی دەست چاپ کراوەو بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە، بە سەرپەرشتی (هەمزە عەبدوڵڵا، جەلال تاڵەبانی، نوری ئەحمەد تاها).
- بەردەوام بووە تا شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ بە زمانی عەرەبیو کوردی، لە دواییدا گوازراوەتەوە بۆ سلێمانی.

*** ڕۆژنامەی ( ئازادی کوردستان ):**

- ڕۆژنامەیەکی نهێنی بووە لەلایەن حیزبی شیوعی عێراقییەوە دەرچووە لە ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوکو لە دواییدا لە سلێمانی بڵاوبووەتەوە.
- سەرپەرشتی دەرکردنی: ساڵح حەیدەریو حەمید عوسمان.

*** بڵاوکراوەی ( صدى الشباب ):**

- بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەیی ڕۆشنبیریی ناوەبەناوە بووە، کەلایەن (لجنة النشاط الثقافي) لەئامادەیی کەرکوکەوە دەرچووە بەزمانی عەرەبی، دەستەی نووسەرانی پێك هاتبوو


صاحبی، محمد امین عصری
آوقات محمد حاج عزت
آوقات عطا ترزی باشی
بشیر
هفته لق ادبیات غزته‌سی
ساتیسی ١٦ فلسدر
سایی — ٢٥
(کرکوك) ...
کنه کلدی خوش رمضان
رمضان ماعیلری

لەماموستا محەمەد شێخ ماموستای عەرەبی و مەحمود عوبێدی ماموستای وێنەو نیگار، ژمارە یەکی لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٨) دەرچووە، ئینجا وەستاوە.

– ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم بڵاوکراوەیە ناوە بەناوەو لە ساڵی جیاجیادا دەرچووە.

*** گۆڤاری (شەفەق- بەیان- شەفەق):**

– لە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٨) دەرچووە.

– خاوەن و سەرنووسەری (عەبدولقادر بەرزنجی) بووە.

– گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی و کۆمەڵایەتی بوو، بەکوردی و عەرەبی نیو مانگ جارێك لە کەرکوك دەردەچوو، بەڕێوەبەری دارایی گۆڤارەکە (عەلی کەمال باپیر ئاغا) بوو، لە دواییدا (حەمید عوسمان) کرا بەسەرنووسەری، جگە لەمەش ئەم ماموستایانە هاوبەشی دەرچوواندنیان داوە: (ئیبراهیم ئەحمەد)، (عەبدولسەمەد خانقا)، (مارف خەزنەدار)و چەند کەسێکی تر.

– لە دوای دەرچوونی دوو ژمارە لە کانوونی دووەم و شوباتی ساڵی (١٩٥٩) لە ساڵی دووەمدا، گوێزرایەوە بۆ سلێمانی ناوی بوو بە (بەیان)و ماموستا گۆران سەرپەرشتی دەرکردنی دەکرد، لە ژمارە سێی نیسانی ساڵی (١٩٥٩) قەبارەکەی بچووك بووەو بووەتە زمانحاڵی ئۆرگانی (انصار السلام)و تەنها شەش ژمارەی لێ دەرچووە بە زمانی کوردی و بەشە عەرەبییەکەی تێدا نەما، پاش ماوەیەك دیسان گواسترایەوە بۆ کەرکوك و ناوەکەی جارانی وەرگرتەوە.

– ژمارەکانی (١، ٢، ٣، ٨)ی لە چاپخانەی (الشمال) و ژمارە (٤)ی لە چاپخانەی (ئەسعد)و ژمارە (٥، ٦)ی لە چاپخانەی (تەمدون)و ژمارە (٧) لە بەغداو ژمارە (٩، ١٠، ١١، ١٢) لە کەرکوك چاپکراوە، هەروەها ژمارەکانی ساڵی دووەم و سێیەم و چوارەمی لەچاپخانەکانی ژین و سلێمانی و شارەوانی کەرکوك و (الشمال) چاپکراوە.

– لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٣) داخرا.

*** ڕۆژنامەی (بشیر):**

– ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی ئەدەبی بووە کە بەزمانی عەرەبی و تورکمانی دەردەچوو، خاوەنەکەی (محەمەد ئەمین عەسری) بووە.

– ژمارە یەکی لە (٢٣)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٨) دەرچووە، بەردەوام بووە تا ژمارە (٢٦)ی لە (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩).

– سەرنووسەرەکەی پارێزەر (محەمەد حاجی عیزەت) بووە، بەشە تورکمانییەکەی (عەتا تەرزی باشی) بووە بەشە عەرەبییەکەی (حەبیب هورمزی) بووە.

– هەموو ژمارەکانی لە چاپخانەی کەرکوك چاپکراوە.

*** گۆڤاری (الجبهة):**

– گۆڤارێکی ئەدەبی و سیاسی هەفتانە بووە بە زمانی عەرەبی.

– خاوەنی ئیمتیازی: (عەبدولسەمەد خانەقا).

– تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچووە لە ساڵی (١٩٥٩).

*** بڵاوکراوەی (العزة):**

– بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەییە لەلایەن قوتابخانەی (العزة)ی سەرەتایی کوڕان بڵاوکراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٥٩)دا، تەنها



یەك ژمارەی لێ بڵاوبووەتەوە بە زمانی عەرەبی.
– دەستەی نووسەران: (عەبدولحەکیم ئۆغلو، عیزەدین عەبدی بەیاتلی، حەسەن عیزەت چارداغلی، سەلاحەدین ساقی، حەسەن فەتاح).

*** بڵاوکراوەی ( صدى الجمهورية ):**
– بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەیی بووە بە رۆنیۆ چاپ کراوە لەلایەن قوتابخانەی (الوطن)ی سەرەتایی کچان.
– ژمارە یەکی لە ئایاری ساڵی (١٩٥٩) تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچووە.

*** رۆژنامەی ( ئازادی ):**
– ژمارە یەکی لە (١)ی ئایاری (١٩٥٩) دەرچووە لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە (رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسییە).
– خاوەنی ئیمتیازی لێپرسراوی پارێزەر (نافع یونس) بوو.
– ئۆرگانی ئاشکرای پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو، تا داخستنی لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٠)، (٥٦) ژمارەی لێ دەرچوو، رۆژنامەیەکی دەوڵەمەندبوو، قەبارەی (٤٤×٢٩)سم بوو.
– لە لێکۆڵینەوەیەکی گۆڤاری نەوشەفەقدا ئاوا باسی هاتووە:
(ژمارە یەکی رۆژنامەی ئازادی لە رۆژی هەینی (١)ی ئایاری ساڵی ١٩٥٩ بە (٤) لاپەرەی قەوارە (٢٩×٤٤)سمو بەدیالێکتی کرمانجی خوارووە بەئەلفو بێی عەرەبی کەوتووەتە بەر دیدەی خوێندەواران... کۆمەڵێك نووسەرو شاعیرو رۆشنبیرو سیاسەتمەداری کورد بەشدارییان لەنووسینی کردووە لەوانە:–
گۆران، ئەحمەد غەفور، محەمەد کەریم فەتحوڵڵا، محەمەدی مەلا کەریم، غەفوری میرزا کەریم، مومتاز حەیدەری، حوسێن عارف، عیزەدین مستەفا رەسوڵ، جەلال دەباغ، عەبدولرەزاق بیمار.
– رۆژنامەی (ئازادی) لەشاری کەرکوك، رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەهۆشیار کردنەوەی چینی رۆشنبیرو چینی زەحمەتکێش و داخوازییەکانی ماف نەتەوایەتی کوردو بەرەو پێشبردنی باری ئەدەبی و هونەری لەکۆمەڵگای کوردەواریدا، لەماوەی ژیانی کورتی شاری کەرکوکدا، تەنها (١٢) ژمارەی لێ بڵاوبووەوەو دوایی گواسترایەوە بەغدا، ئەویش لەبەر بارودۆخی شاری کەرکوك بەرەو ئاڵۆزیو ئاستەنگ دەرۆیشت لەبەر ئەوە هەتا کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٠) لە بەغدا بەردەوام بوو.
– ئەو ژمارانەی رۆژنامەی ئازادی، کە لەماوەی زیاتر لە ساڵو نیوێك بڵاوکرایەوە، گەنجینەیەکی بایەخداری مێژووی ئەو سەردەمەی کوردە لە هەموو بارەکانییەوە، سیاسیو ئەدەبیو رۆشنبیریو نەتەوەیی.

*** رۆژنامەی ( گاوریاغی ):**
– رۆژنامەیەکی هەفتانەی ئەدەبی بووە، کە بەردەوامی رۆژنامەی کەرکوك بووە، لەدوای شۆرش (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨)، ئەرکی دەرچوونی لەلایەن ئەدیب (عوسمان خۆشناو) بووە.
– بە زمانی کوردیو عەرەبی بووە، بەڵام لە ژمارە (٢)ەوە تەنها بە عەرەبی دەرچووە.
– ژمارە یەکی لە (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٩) دەرچووەو (٣٤) ژمارەی لێدەرچووە تا (١٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٠) بەردەوام بووە، ئینجا ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (کەرکوك) و لە(٢٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٠) لەژێر ژمارەی (١٧٣١) رۆژنامەکە بەردەوام بووەتەوە.

*** گۆڤاری ( الطليعة ):**
– گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە، خاوەنی ئیمتیازی (دار المعلمين)ی کەرکوك بوو بەزمانی عەرەبی دەردەچوو، بە قەبارەی (٣٢) لاپەرە.
– دەستەی نووسەرانی: (سەعدی جەباری، زوهدی داووی، کەمال نامق) بوونە.
– ژمارەی یەکەمی لە مانگی حوزەیرانی (١٩٥٩) دەرچووە.

*** گۆڤاری ( دەنگی قوتابیان – صوت الطلبة ):**
– رۆژنامەیەکی هەفتانەی قوتابیانە، لقی یەکێتی قوتابیانی عێراق لە کەرکوك بڵاوی دەکردەوە، بە کوردیو عەرەبیو تورکمانی.
– لە (١٣)ی ئابی ساڵی (١٩٥٩) دەرچووە، هەر ئەو ساڵە ژیاو تەنها دوو ژمارەی لێ بڵاوبووەتەوە بە هەشت لاپەرە، لە چاپخانەی (الشمال) لە کەرکوك چاپ کراوە.


صوت الطلبة

* **ڕۆژنامەی ( رای گەل - راي الاهالي ):**
- ڕۆژنامەیەکی سیاسی بووە، بە زمانی عەرەبیو کوردی هەموو هەفتەیەك دەرچووە، ئۆرگانو زمان حاڵی پارتی (نیشتمانی- دیموکراتی) بوو.
- یەکەم ژمارەی لە (٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٩) دەرچووە.
- سەرنووسەری (سدیق عەلی بلوکینی) بووە.
- بەڕێوەبەری نووسین (محەمەد مەردان قەڵەمچی) بووە، لە دواییدا لە ژمارە (٦)ەوە (سدیق عەبدوڵڵا موختار) بووە، لە ژمارە (٦٩)ەوە (نازم وەنداوی) بووە، (مەحمود تەوفیق)یش لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارە بووە.
- لە (١٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) لە دەرچوون وەستاوە بەهۆی کۆچی دوایی خاوەنەکەی، بەڵام لەهەندێك سەرچاوەدا کۆتایی دەرچوونی بە (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) دانراوە.
- دوا ژمارەی (٧٢) بووە.

* **گۆڤاری ( العرين ):**
- گۆڤارێکی سەربازی ڕۆشنبیریی بووە، بە زمانی عەرەبی دەردەچوو.
- خاوەن ئیمتیازی (قيادة الفرقة الثانية) لە کەرکوك بووە.
- ژمارە یەکی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٩) دەرچووە، تا نزیکەی (٥) ساڵ بەردەوام بووە.
- سەرنووسەری گۆڤارەکە (مەهدی عەلی ساڵحی).
- سکرتێری نووسینی (نامیق بەیرەقدار).
- دەستەی نووسەران: (عەبدولغەنی ساڵح، محەمەد فەتحی، عەبدولئەمیر ئەلروبەیعی، محەمەد تەیب ئیبراهیم، تۆفیق حاجی یاسین).

* **بڵاوکراوەی ( بێ ئیش ):**
- بڵاوکراوەیەکی دەسنووس بووە لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٠) لەلایەن کۆمەڵێك ڕۆشنبیری قەزای چەمچەماڵەوە بە زمانی کوردی دەرچووە.

* **گۆڤاری ( الطليعة ):**
- گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی و پەروەردەیی بووە، لەلایەن یەکێتی گشتی قوتابیانی عێراق لقی کەرکوك دەرچووە، بەزمانی کوردیو عەرەبیو تورکمانی.
- ژمارەکانی (١-٣) لە ساڵی (١٩٦٠) دەرچووە، ئینجا لەدەرچوون وەستاوە. لە چاپخانەی (الشمال) لە کەرکوك چاپکراوە.

* **گۆڤاری ( الربيع ):**
- گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی، کۆمەڵایەتی مانگانەبوو.
- خاوەنی ئیمتیازی گۆڤارەکە (دانیال داود بنیامین).
- سەرنووسەری (تەیمور ساحێب قران) بوو.
- لە (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٠)ەوە تا (١٦) ئابی ساڵی (١٩٦١) بەردەوام بوو لەدەرچوون.
- ئەم گۆڤارە بەزمانی عەرەبیو ئاسووری دەرچووە.

* **گۆڤاری ( النشاط المدرسي ):**
- بڵاوکراوەیەکی هونەری، وەرزی بووە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوك دەرچووە لە ساڵی ١٩٦٢.
- دەستەی نووسەرانی: (مەحمود عوبێدی)و (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان)و سەلاحەددین عەلی شێخلەر)و (نۆئێل بەهجەت) بووە.
- ژمارە یەکی لە ساڵی خوێندنی (١٩٦٢-١٩٦٣) بووەو ژمارە (٢)ی لە ساڵی خوێندنی (١٩٦٣-١٩٦٤)دەرچووەو ئینجا لە دەرچوون وەستاوە.
- بە زمانی عەرەبیو بە قەبارەی (٥٨) لاپەڕە دەچووە، لە چاپخانەی (الشمال) چاپکراوە.
- بەڵام لە (كشاف الجرائد)دا بەهەمان شێوە بەهەمان دەستە بەناوی (النشاط الفني)یەوە باسی دەکاتو هیچ سەرچاوەیەکی تر لەبەر دەستدا نییە ئەو ڕاستییە بسەلمێنێت.

* **ڕۆژنامەی ( ڕێگای کوردستان ):**
- ڕۆژنامەیەکی حیزبی شیوعی عێراقی ڕێکخراوی هەرێمی کوردستان بووە، لە کەرکوك بە شێوەیەکی نهێنی بە زمانی کوردی دەرچووە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٦٢ دەرچووە تا (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) بەردەوام بووە.
- بە سەرپەرشتی ئەحمەد دڵزار بوو.

* **ڕۆژنامەی ( النهضة ):**
- ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بووە بە زمانی عەرەبی بەڵام بە هەفتانە دەرچووە.
- خاوەنی ئیمتیاز (عەبدولعەزیز ئەلتالیبی).
- ژمارە یەکەی لە (١٢)ی ئاداری (١٩٦٣) دەرچووە.
- ژمارە سێی لە (٢٨)ی ئاداری ١٩٦٣ دەرچووە بە چوار لاپەڕە بە قەبارەی گەورە.
- سەرنووسەرەکەی (محەمەد سدیق نەقاش) بووە.
- لە دواییدا چووەتە سلێمانیو بە کوردیو عەرەبی دەرچووە.

* **گۆڤاری ( العامل الاشتراكي ):**
- گۆڤارێکی هەفتانەی سیاسی بوو.
- خاوەنی ئیمتیازی (ڕەجەب تولفاح ئەلجومەیلی) بووە.
- سەرنووسەری (دکتۆر خەلیل عەباسی) بوو.
- دەستەی نووسەرانی (محەمەد حوسێن داغستانی) بووە.
- ژمارە یەکی لە (٣٠)ی ئایاری ساڵی (١٩٦٣) دەرچووەو لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) لە دەرچوون وەستاوە.

*** بڵاوکراوەی (صدى كركوك الرياضي):**

- بڵاوکراوەیەکی وەرزشی وێنەدار بووە بە زمانی عەرەبی.
- لەلایەن بەڕێزان (ئیسماعیل سرت تورکمن) و (محەمەد حوسێن داغستانی)وە دەرچووە تەنها چوار ژمارەی لێدەرچووە.
- ژمارە یەکی لەساڵی (١٩٦٦)، ژمارە (٢)و (٣)ی لەساڵی (١٩٦٧)و ژمارە (٤)ی لە کۆتایی ساڵی (١٩٦٧) دەرچووە ئینجا لەدەرچوون وەستاوە.




*** ڕۆژنامەی (العراق الرياضي):**

- ڕۆژنامەیەکی وەرزشییە بە بۆنەی بەدەستهاتنی خەڵاتی تۆپی پێ لە ساڵی (١٩٦٦) بەسەرپەرشتی (ئەحمەد محەمەد کەرکوکی) یەك ژمارەی لێ دەرچووە.

*** بڵاوکراوەی (هەللولیا):**

- بڵاوکراوەیەکی دەسنووسە بە زمانی کوردی وعەرەبی لەنێوان ساڵانی (١٩٦٦ - ١٩٦٧)دا بڵاوکراوەتەوە، لە گوندی (دێبنە)ی نزیك کەلار ناوەکەشی لە ناوی ڕۆمانێکی (یابانی)یەوە وەرگیراوە کە بە مانای (بەخێر هاتن) دێت.
- نزیکەی هەشت ژمارەی دەسنووسی لێدەرچووە، ژمارەی لاپەرەکانی لەنێوان (٤ -٨) لاپەرەیە بە قەبارەی مام ناوەندی.
- ئەو نووسەرانەی بەشدارییان تێدا کردووە: (ئەمجەد شاکەلی، شێخ محەمەد شێخ ئەحمەد شاکەلی)، جگە لەوەش بە زۆری دەنگوباس و هەواڵی ناوچەکەو بارودۆخی کشتوکاڵ و قسەکردن لەسەر کوردایەتی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی و بایەخدان بە هونەری کاریکاتێری.

*** گۆڤاری (پشکۆ):**

- گۆڤارێکی نیو فولسکاب بوو بە ڕۆنیۆ بە زمانی کوردی چاپ کراوە.
- دەنگی مامۆستایانی کوردستانی لقی کەرکوك بووە.
- ژمارە یەکی لە ساڵی (١٩٦٧)و ژمارە حەوتی ساڵی سێیەم لە تەمموزی ساڵی (١٩٦٩) دەرچووە.
- بەردەوام بووە تا ساڵی (١٩٦٩)و تەنها (١٨) ژمارەی لێ دەرچووە.
- دەستەی نووسەران: (قادر مەلا عومەر، عەبدوڵڵا حەمید، عەبدولستار تاهیر، عەبدوڵڵا سەراج، عەبدولقادر سەلام) بووە.

*** ڕۆژنامەی (أنباء الرياضة و الشباب):**

- ڕۆژنامەیەکی وەرزشی هەفتانە بوو، بەزمانی عەرەبی دەردەچوو.
- خاوەنی ئیمتیازی (ئەحمەد محەمەد کەرکوکی) بووە.
- دەستەی نووسەرانی (نەبیل تەبەقچلی کوڕی نازم تەبەقچلی) بووە.
- یەك ژمارەی لێدەرچووە لە ڕۆژی دووشەممە (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٧) بە چوار لاپەرە، بەهۆی نەبوونی پارە لەدەرچوون وەستاوە، ژمارە یەکی لە کتێبخانەی (ئەحمەد قۆشچو ئۆغلو) هەیە.

*** بڵاوکراوەی (بەرزنجە):**

- بڵاوکراوەیەکی دەسنووسی بووە، لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧ - ١٩٦٨)بڵاوکراوەتەوە، بریتی بووە لە بڵاوکراوەیەکی ڕووناکبیری، تەنها (١٥) ژمارەی لێ دەرچووە.
- ئەم بڵاوکراوەیە لەلایەن (لەتیف هەڵمەت)ەوە بڵاوکراوەتەوە.
- هەریەکە لەم نووسەرانە بابەتیان تێدا بڵاوکردووەتەوە: (ئەمجەد محەمەد عەبدولقادر)و (ئەحمەد شاکەلی) کە لەو دەمەدا بە ناوی (ئەنوەر شاکەل) بابەتی بڵاوکردووەتەوە، (لەتیف هەڵمەت)و (فەرهاد شاکەلی) ئەم بڵاوکراوەیە بە زمانی کوردی بووە.

*** بڵاوکراوەی (كركوك اليوم):**

- بڵاوکراوەیەکی ناوە بەناوەی ناوخۆ بوو، بەزمانی عەرەبی لەلایەن (لجنة التوعية)ی شارەوانی کەرکوکەوە.
- ژمارە یەکی لە ساڵی (١٩٦٨) دەرچووە، بەردەوام بووە تا ژمارە (٥)ی ساڵی (١٩٧٢)، و لەچاپخانەی شارەوانی دەردەچوو.
- ئەم بەڕێزانە دەوریان هەبوو لەدەرچوونی:- ئیبراهیم محەمەد مەحمود، فەخرەددین محێدین، ئیسماعیل تەها، نیهاد هورمزی، عوسمان خۆشناو، سەیفەدین محەمەد سەعید (أبو عفاف)، محەمەد عەلی قیردار، محەمەد سەلامی، عەدنان محەمەد سامی، جاسم محەمەد (جاسم)، حەسەن عەلی زەند.

*** بڵاوکراوەی (شە پۆڵەکان):**

- بڵاوکراوەیەکی دەسنووسە، لە ساڵی (١٩٦٨) لە کەلار بڵاوکراوەتەوە ، تەنها دوو ژمارەی لێ دەرچووە، بە دەستخەتی (سیروان حاجی ئەمین) نووسراوەتەوە.
- ژمارە (١)ی تەنها ١٥ دانە یان (نسخە)ی لێدەرکراوەو تارادەیەك بە ناوچەکەدا بڵاوکراوەتەوە ئەوانەی کە نووسین و بابەتی جۆر بە جۆری ڕووناکبیرییان تیا بڵاوکردبێتەوە کەسانی وەك (فەرهاد شاکەلی، غازی فەیسەل، محەمەد داماو) بوونی ئەمەی دواییان لەو ماوەیەدا بە ناوی (محەمەد بێکراس) بووە.

*** گۆڤاری (مەشخەڵ):**

- گۆڤارێکی سیاسی بووە، لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوی ئەکردەوە.
- ژمارە یەکی لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٨) بڵاوبووەتەوە.
- گۆڤاری مەشخەڵ گۆڤارێکی لقی کەرکوکی پارتی بوو، لەبەر ئەوەی کەرکوکیش شارێکە تێکەڵاوە ئەم گۆڤارە بەزمانی کوردی و تورکمانی و عەرەبی بڵاوئەکرایەوە.
- گۆڤاری مەشخەڵ هەر لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەی تا دوا ژمارەی وتاری پڕ جۆشی کوردایەتی بڵاوئەکردەوەو دەورێکی کاریگەری هەبوو لە سنووری پارێزگای کەرکوك، ئەم گۆڤارە بەڕۆنیۆ لەچاپ دراوە.

*** گۆڤاری (هەڵەت):**







- گۆڤارێکی سیاسی پەروەردەیی هەواڵی بووە لەلایەن دەستەی سەرۆکایەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٩٦٨-١٩٧٠ بە شێوەیەکی نەهێنی و وەرزی دەرچووە بە زمانی کوردی.
- دەستەی نووسەرانی: (عەبدولقادر مەلا عومەر گونبەدی) و (عەبدولقادر سەلام) و (عەبدوڵڵا حەمید).
- لە سلێمانی بە ڕۆنیۆ چاپکراوەو لە کەرکوك بڵاوکراوەتەوە.

*** بڵاوکراوەی (باوە شاسوار):**

- بڵاوکراوەیەکی ئەدەبی - ڕووناکبیری دەسنووس بووە.
- لە ساڵی (١٩٦٩) هەر لە شاری (کفری) بڵاوکراوەتەوە تەنها یەك ژمارەی لێ بڵاوبووەتەوە.
- هەر یەکە لە (فەرهاد شاکەلی) و (لەتیف هەڵمەت) و (کەنعان مەدحەد)ەوە سەرپەرشتی بڵاوکراوەکەیان کردووە.

*** سەردیواری (الكواكب):**

- لە ساڵی (١٩٦٩) لەلایەن حەمە ساڵح تۆفیق لە دواناوەندی کفری بڵاوکراوەتەوە، بە زمانی عەرەبی، زیاتر بابەتی هەمە جۆربووە، تەنها دوو ژمارەی لێدەرچووە.

*** بڵاوکراوەی (الازدهار):**

– بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەیی ڕۆشنبیریی گشتی بوو، خاوەنەکەی ناوەندی کچانی (الازدهار) بووە.
– ژمارە یەکی لە ساڵی (١٩٦٩) دەرچووە.
– هەر یەکە لە مامۆستایان (سەحاب محەمەد وەفیق) و (فەوزیە عەبدوڵڵا هیندی) و (شەهرزان عەبد محەمەد باروودی) دەستیان لەدەرچوونی هەبووە.

*** بڵاوکراوەی (المربي):**

– بڵاوکراوەیەکی قوتابخانەیی ناو بەناوەیە، لەلایەن پەیمانگای (دار المعلمین) لە کەرکوك دەردەچوو، بە قەبارەی (٧٤) لاپەڕە.
– بەسەرپەرشتی دەستەی زمانی عەرەبی لە پەیمانگا، کە پێکهاتبوو لەبەڕێزان: (بورهانەددین حوسامەددین)، (حوسامەددین کۆپرلۆ)، (نەجدەت قاسم ساڵەیی)، (عەبدولموتەلیب ئەلسەعدی).
– ژمارە یەکی لە ساڵی (١٩٦٩) دەرچووەو ئینجا وەستاوە.

*** گۆڤاری (English Magazine):**

– لە ساڵی (١٩٦٩) یەکەم ژمارەی دەرچووە بە زمانی ئینگلیزی، بە سەپەرشتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی کەرکوکی کچان مامۆستا (سەحاب وەفیق)و مامۆستا (فائیزە موراد).
– یەکەم ژمارەی بە حەڤدە لاپەڕە بە قەبارەی گۆڤار دەرچووە.

*** گۆڤاری (العامل):**

– گۆڤارێکی کرێکاریی ڕۆشنبیریی، نیو مانگییە، بەزمانی عەرەبیو بە چوار لاپەڕە دەردەچوو، کە زمانی حاڵی یەکێتی سەندیکای کرێکارانی کەرکوك بوو.
– ژمارە یەکی لە (١٨)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩) دەرچووە.
– شەش ژمارەی لێ دەچووەو لە (١) ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لە دەرچوون وەستاوە.
– سەرنووسەر (ئیبراهیم حەسەن کەنانی).
– بەڕێوبەری نووسین (عەبدولئەمیر خدەیر).
– سکرتێری نووسین (محەمەد حوسێن داغستانی).
– لە چاپخانەی (بلدیة کرکوك) چاپکراوە.

*** سەردیواری (گیڤارا):**

– لە ساڵی (١٩٧٠) لەلایەن (فەرهاد شاکەلی) بڵاوکراوەتەوە.

*** سەردیواری (جیکۆ):**

– لەلایەن (فەرهاد شاکەلی) لە دواناوەندی کفری بڵاوکراوەتەوە.
– تەنها یەك ژمارەی لێدەرکردووە، تایبەت بووە بە وتارو نووسینی ئەدەبی.

*** گۆڤاری (NOWLEDGE - المعرفة):**

– لەلایەن ئامادەیی (کەرکوك)ی کوڕان لە ساڵی (١٩٧٠) بە هەژدە لاپەڕە بە زمانی ئینگلیزی دەرچووە.
– بە سەرپەرشتی مامۆستای ئینگلیزی (عەبدولحوسێن جەعفەر)و (شەمسەددین تاهیر)و کۆمەڵێك قوتابی.
– لە چاپخانەی (الشمال) لە کەرکوك چاپ کراوە، بە قەبارەی (١٨) لاپەڕە.

*** بڵاوکراوەی (منع وقوع الحوادث):**

– بڵاوکراوەیەکە لە شێوەی گۆڤار بە قەبارەی بچووك، لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراق (کەرکوك)و کۆمپانیای نەوتی موسل (عەین زالە) بە زمانی عەرەبیو ئینگلیزی بە قەبارەی (٢٤) لاپەڕە دەرچووە.
– ژمارەی یەکی تا ژمارە سێی لە ساڵی (١٩٧٠) دەرچووە.

*** ڕۆژنامەی (سسلر):**

– ڕۆژنامەیەکی ڕۆشنبیریو هونەری بووە بە زمانی تورکمانی.
– ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٧١) دەرچووە.
– ژمارە (٢)ی لە ساڵی (١٩٧٢) دەرچووە.
– سەرنووسەری: (ئەحمەد محەمەد کەرکوکی).
– لە چاپخانەی (الجمهورية) لە کەرکوك چاپکراوە.

*** گۆڤاری (الصداقة):**

– گۆڤارێکی منداڵان بووە لەسەر هەر مانگێك بە یەك دانە دەرچووە.
– ژمارە (١) لە کانوونی دووەمی (١٩٧٢) دەرچووە.
– لەلایەن قوتابیان وەلید عەبدولڕەحمان و سلێمان عومەر لە ناوەندی مەرکەزی کوڕان دەرچووە.

*** گۆڤاری (النمر):**

– گۆڤارێکی سەربازی ڕۆشنبیرییە لەلایەن (قيادة الفرقة الثانية)وە دەرچووە.
– ژمارە یەکی لە (٦)ی کانوونی دووەمی (١٩٧١) بە قەبارەی (٦٤) لاپەڕە بە زمانی عەرەبی دەرچووە.
– دەستەی نووسەرانی بریتی بووە لەم بەڕێزانە: عەقید ڕوکن (تاریق نەجمەددین)، موقەدەم ڕوکن (نامیق بیرەقدار)، ڕائید ڕوکن (عەبدولجەواد زەنون).

*** بڵاوکراوەی (کرکوك):**

– ئەم بڵاوکراوەیە ئیمتیازی دەچوونی وەرگرتووە لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧١)، بەڵام پارێزگای کەرکوك دەرینەکردووەو هیچ سەرچاوەیەك ئاماژەی پێ نەکردووە.

*** گۆڤاری (باباگوڕ گوڕ):**

– لەلایەن لقی کەرکوکی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەرچووە.

– تەنها دوو ژمارەی لە ساڵی (١٩٧٢) لێ بڵاوبووەتەوە.

*** گۆڤاری (گزنگ):**

– کۆمەڵە بەرهەمێکی هەمەڕەنگی نووسەرانی کەرکوکە. لە شێوە گۆڤار بڵاوکراوەتەوە، یەکێتی نووسەرانی کوردستان. لقی کەرکوك، ناوەبەناوە دەریکردووە.

– بەسەرپەرشتی (ڕەزا شوان).

– ژمارە (١)ی لە ئاداری ساڵی (١٩٧٢) دەرچووە، بە قەبارەی (٨٠) لاپەڕە.

– پێوانەی ژمارەکانی بەم شێوەیە بووە: (١٥×٢١)سم. (١٦،٥×٢١)سم (١٧×٢٠)سم ژمارەی لاپەڕەکانی، ٨٠، ٩٢، ١٢٠، لەچاپخانەی شیمال و چاپخانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان چاپکراوە.

– دوای (١١) ساڵ دابڕان لە دەرچوونی دووبارە لە چیا لەلایەن یەکێتی نووسەرانی کوردستانەوە لقی کەرکوك بەسەرپەرشتی (حەمە کەریم عارف)و (محەمەد موکری) و (ئەحمەد عارف) ژمارەی (١)ی لە ئاداری ساڵی (١٩٨٣) دەرچووە، کە لەو ماوەیەدا لەنێوان ساڵانی (١٩٨٣–١٩٨٥) (١٣) ژمارەی لێ دەرچووە، ژمارە (١٥)ی لە دوای چوار ساڵ وەستان لە نیسانی ساڵی (١٩٨٩) دەرچووە، دوای وەستان لە دوو ساڵ و لە دوای ڕاپەڕینە مەزنەکە ساڵی (١٩٩١) دوو ژمارەی (١٦)و (١٧)ی لە سلێمانی لێ دەچووە کە ژمارە (١٧) لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) بە زمانی کوردی عەرەبی دەرچووە.

– سەرنووسەری (حەمە کەریم عارف).

– سکرتێری نووسین: (عەبدوڵڵا سەراج).

– دەستەی نووسەران (جەلیل کاکە وەیس)و (ئەحمەد عارف)و (نەجیب گەرمیانی)و (سیروان ڕەحیم)و (سابیر سدیق)و (محەمەد زیاد تاها)و (جەلیل زەنگەنە).

– لە دوای (١٣) ساڵ وەستان و لە دوای ڕزگارکردنی کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣) ژمارە (١٨)ی لە تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) لە قەبارەی (١٢٨) لاپەڕە بە زمانی کوردی دەرچووە.

– سێ پاشکۆیی بەناوی گزنگی بچووکانەوە هەبووە کە ژمارە (١)ی ئاداری ١٩٨٥، ژمارە (٢) ئابی ١٩٨٥، ژمارە (٣) ئەیلولی ١٩٨٥.

*** گۆڤاری (ئاڵای سوور):**

– بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی نهێنی ناوەبەناوە بووە، کە لەلایەن (ئۆرگانی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستانی عێراقی) لە کەرکوك دەریدەکرد.

– سەرپەشتیاری (شەهاب شێخ نوری شێخ ساڵح)، (فەرەیدون عەبدولقادر)، (ئیحسان نەجم).

– ژمارە یەکی لەکۆتایی (١٩٧٢) دەرچووە، ژمارە (٢)ی لە شوباتی ساڵی (١٩٧٣)دەرچووە، ژمارە (٣)ی لە کۆتایی




ساڵی (١٩٧٣) لە کەرکوك دەرچووە، تەنها بەزمانی کوردی بووە بەڕۆنیۆ چاپکراوە.

*** بڵاوکراوەی (المربي):**

– بڵاوکراوەیەکی ناو بەناوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی بووە، کە یەکێتی مامۆستایانی کەرکوك بەزمانی عەرەبی و تورکمانی دەریان کردووە.

– سەرنووسەری قاسم یەحیا ڕەجەب بووە.

– ژمارە یەکی لە (٢٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢) دەرچووە.

– (١٠) ژمارەی لێدەرچووە بەڕۆنیۆ چاپکراوە، کە دوا ژمارەی لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٥) بووە.

– قەبارەی لاپەڕەکانی لەنێوان (١٣–١٨) لاپەڕە بووە.

*** گۆڤاری (باباگوڕ گوڕ):**

– لەلایەن لقی کەرکوکی قوتابیانی کوردستانی عێراق دەرچووە لە کەرکوك، بەزمانی کوردی دەردەچوو.

– ژمارە (١) تا ژمارە (٣)ی لە ساڵی (١٩٧٣) دەرچووە، دوا ژمارەی لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵ بووە.

– بەڵام لەدوای هەڵگیرسانی شەڕ لەکوردستان لە ساڵی (١٩٧٤)و جێگربوونی ئەو لقە لە (تەوێڵە) لەهەورامان، هەوڵێکی زۆریان دا بەدەرکردنی ژمارەیەکی تری گۆڤارەکە بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی بابەتی نەتوانرا ئەو ژمارەیە دەربکرێت.

– ئەوانەی بەشدارییان کردووە لە دەرچوونی ئەم گۆڤارەدا: (زاهیر عەلی عەلی ڕۆژبەیانی، حەمە ساڵح جەباری، حوسێن ڕەسوڵ، سەباح جەوهەر، محەمەد عەزیز، ئازاد عەبدولمەجید، عەلی حوسێن، نەجمەدین فاتح، ئەمین کەریم).

*** گۆڤاری (كوچوك قارداش):**
- گۆڤارێکی منداڵان بووە لە شێوەی کتێب دەرچووە بە (٨) لاپەڕە بە زمانی تورکمانی.
- یەکەم ژمارەی لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٣) دەرچووە.
- سەرپەرشتیاری گشتی: (ئەحمەد محەمەد کەرکوکی).
- لە چاپخانەی (الشمال) لە کەرکوك چاپکراوە.

*** بڵاوکراوەی (الموظفين الاسبوعية):**
- بڵاوکراوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی مەکتەبی تایبەتی و بەدواداچوونی دەزگای گشتی نەوتی باکوور بووە لە کەرکوك.
- ژمارە (١)ی لە (١٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٥) بە زمانی عەرەبی دەرچووە.

*** گۆڤاری (شەهیدانی کوردستان):**
- گۆڤارێکی سیاسی و ڕۆشنبیری بووە، لەلایەن لیژنەی ڕاگەیاندنی لقی (٣)ی کەرکوك و (٤)ی سلێمانی پارتی دیموکراتی کوردستان بە شێوەی نهێنی و ناوەوناو لە چیا دەرچووە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٨٢) بە زمانی کوردی دەرچووە.

*** گۆڤاری (هەنگاو):**
- گۆڤارێکی دەستنووسی ناوخۆ بووە، کە لەلایەن بەرەی ڕزگاریخوازی زەحمەتکێشانەوە بە شێوەیەکی نهێنی، لەنێوان ساڵانی (١٩٨٢-١٩٨٦) لە کەرکوك بە زمانی کوردی دەرچووە.

*** گۆڤاری (ڕابەر):**
- گۆڤارێکی ئەدەبی و ڕووناکبیری بووە بەدەستنووس نوسراوە لەلایەن کۆمەڵێك ڕۆشنبیری ئەو کاتەی کەرکوك لە ساڵی (١٩٨٣).
- بەپێی زانیاری تەنها حەڤدە ژمارەی لێدەرچووە بەقەبارەی (٣٠-٤٠) لاپەڕە ئەو نوسەرانەی کە بەشدارییان کردووە نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، شۆرش حەسەنی شێخ عەلی، ئەرارات (ئومێد مەحمود)، ئاگر.

*** گۆڤاری (سەنگەر):**
- گۆڤارێك بوو لەلایەن ڕاگەیاندنی مەرکەزی دووی کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە گوندی سەرگەڵو دەرچووە.
- تەنها یەك ژمارەی لێدەرچووە لە تەمموزی ساڵی (١٩٨٣) بە چل لاپەڕە و بە زمانی کوردی دەرچووە.

*** گۆڤاری (باوە گوڕ گوڕ):**
- گۆڤارێکە لەلایەن یەکێتی خوێندکارانی کوردستانی عێراق لقی کەرکوك دەرچووە، بە پێوانەی نیوفولسکاب، ژمارەی لاپەڕەکانی (٢٠) لاپەڕە، لە چاپخانەی (ئیبراهیم عەزۆ) لە (سەرگەڵوو) چاپکراوە بەزمانی کوردی.
- لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٣) تەنها یەك ژمارەی لێدەرچووە.

*** بڵاوکراوەی (ڕێنوێن):**
- بڵاوکراوەیەکی لقی سلێمانی و کەرکوکی حیزبی شیوعی عێراقی بووە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٨٤) بە زمانی کوردی و بە پێوانەی (٢١×٣١) سم لە چیا بڵاوبووەتەوە.

*** پاشکۆی (شانۆ):**
- وەکو پاشکۆیەکی گۆڤاری گزنگ لە چیا لە ساڵی (١٩٨٤) دەرچووە تایبەت بووە بە شانۆی کوردی.

*** بڵاوکراوەی (دەنگی پێشمەرگە - صوت الانصار):**
- بڵاوکراوەیەکی ناوبەناو بووە لەلایەن فەوجی (١٥)ی قەرەداغ و گەرمیان و کەرکوك و سلێمانی حیزبی شیوعی عێراقی دەرچووە بە زمانی عەرەبی و کوردی.
- ژمارە (١)ی لە ئاداری ساڵی (١٩٨٤)، بە پێوانەی (٣٤×٢١) سم .

*** بڵاوکراوەی (ئاڵای پێشمەرگە):**
- بڵاوکراوەی حیزبی شیوعی عێراقی، ناوەندی کەرکوك و سلێمانی بووە.
- ژمارە (١)ی لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٤) دەرچووە.
- ژمارە (٢)ی ساڵی یەکەمی لە کۆتایی مانگی تەموزی ساڵی (١٩٨٤) دەرچووە.
- بڵاوکراوەیەکی سیاسی و هەواڵی بووە کە چالاکییەکانی پێشمەرگەی لە کوردستان بە شێوەی نهێنی و بە زمانی کوردی بڵاوکرووەتەوە.

*** گۆڤاری (باوە گوڕ گوڕ - بابە گوڕگوڕ):**
- گۆڤارێکی ڕامیاری و ڕۆشنبیری بوو، لقی (٣)ی پارتی دیموکراتی کوردستان بەزمانی کوردی بە شێوەیەکی ناو بەناو بڵاوی ئەکردەوە.
- ژمارەی یەکەمی لە ئابی ساڵی (١٩٨٤) بڵاوبووەتەوە کە ڕێکەوتی بیرەوەری دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەگرێتەوە.
- ژمارە (١٢-١٣)ی لە تشرینی یەکەم و دووەمی ساڵی (١٩٨٦) دەرچووە، تەنها (١٥) ژمارەی لێدەرچووە.
- لە ژمارە (١٤-١٥) لە نیسانی - ئایاری ساڵی (١٩٨٧) ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (بابە گوڕگوڕ).
- لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) جارێکی تر لە (هەڵەبجە)،

ژمارە یەکی لە شوباتی ساڵی (١٩٩٦) دەرچووە بە قەبارەی (٤٤) لاپەڕە بە ناوی (باوە گوڕگوڕ)و تەنها سێ ژمارەی لێ دەرچووە.
- خاوەن ئیمتیازی (نوری حەمە عەلی).
- سەرنووسەر (حەمە سەعید کەلاری).
- سکرتێری نووسین (ئیبراهیم مەلا).
- ژمارە (٤) لە ئاداری ساڵی (١٩٩٧) لە هەولێر دەچووە لەلایەن مەکتەبی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان بە قەبارەی (٦١) لاپەڕە.
- ژمارە (٥)ی لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٧) دەرچووە بە قەبارەی (٩٦) لاپەڕە، کە خاوەنی ئیمتیازی (سەلاح دەلۆ) بووەو سەرنووسەر (عومەر ئەحمەد)و دەستەی نووسەران (یوسف لەتیف)و (حەمە سەعید کەلاری)و (دلێر کەماڵ ئاغا) بووە.

*** گۆڤاری (نێرگز):**
- کۆمەڵە بەرهەمێکی ڕۆشنبیری و ئەدەبییە، گۆڤارێکی ساڵانە بوو، بە پێوانی (١٧×٢٣،٥)سم.
- لە چاپخانەی (حوادث) لە بەغدا چاپکراوە بەزمانی کوردی.
- ژمارە (١) لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٤) بە قەبارەی (٩٤) لاپەڕە، ژمارە (٢)ی لە نیسانی ساڵی (١٩٨٥) بە قەبارەی (١٥٦) لاپەڕە دەرچووە.

*** بڵاوکراوەی (التأمیم):**
- مانگانەیەکی گشتی بووە سەرکردایەتی (الجیش الشعبي) لە کەرکوک دەریدەکرد.
- ژمارە (١) لە ساڵی (١٩٨٥) بە زمانی عەرەبی و بە (٤٠) لاپەڕە دەرچووە.

*** گۆڤاری (گزنگی بچوکان):**
- ژمارەی تایبەت بوو بە منداڵان و سەر بە گۆڤاری (گزنگ) بووە، لە (چیا) بڵاوکراوەتەوە.
- ژمارە (١)ی لە ئاداری ساڵی (١٩٨٥) بە (٥٢) لاپەڕە، (٣) ژمارەی لێ دەرچووە، ژمارە (٣)ی لە ئەیلولی ساڵی (١٩٨٥).

*** ڕۆژنامەی (مهرجان التأمیم):**
- ڕۆژنامەیەکی هەواڵی ڕۆژانە بوو لەلایەن دەستەی ڕاگەیاندنی ڕۆژی پارێزگای (التأمیم) دەرچووە.
- ژمارە یەکی لە (٢٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٥) بە چوار لاپەڕە بە زمانی عەرەبی دەرچووە ژمارە چواری کە دوا ژمارەیە لە (٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٥) دەرچووە، لە چاپخانەی شارەوانی بە چاپ گەیەنراوە.
- سەر نووسەری: موحسن دوازە عەلی بووە.

*** گۆڤاری (هەڵمەت):**
- گۆڤارێکی وەرزییە، لەلایەن لقی سلێمانی و کەرکوکی و کۆمەڵەی نووسەران و ڕۆژنامەنووسان و هونەرمەندانی پێشمەرگەی دیموکراتی عێراقی، بە زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە.
- تەنها یەک ژمارەی لە ئایاری ساڵی (١٩٨٥) دەرچووە.

*** گۆڤاری (پەیامی برایەتی):**
- گۆڤاری لقی کەرکوکی حیزبی سۆشیالیستی کوردستانی عێراقە. دەرچوونی وەرزی بووە بەزمانی کوردی و عەرەبی لە چیا.
- ژمارە (١)ی لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) ژمارە (٧)ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨) دەرچووە.

*** گۆڤاری (ڕابەر):**
- گۆڤارێکی ئەدەبی دەسنووسی مارکسی بووە، کە کۆمەڵێک لە نووسەرانی شیوعی لە کەرکوک دەریان کردووە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٨٧) بە زمانی کوردی دەرچووە.
- ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بووەو بە قەبارەی (٦٠-٩٠) لاپەڕە دەرچووە.
- هەر یەکە لە (کۆشش)و (مەشخەڵ)و (هۆشەنگ) سەرپەرشتیارن کردووە.

*** گۆڤاری (ڕێبەر):**
- گۆڤارێکی ئەدەبی دەسنووسە، لەلایەن ڕێکخستنەکانی (التیار الشیوعي) لە کەرکوک بە شێوەی نهێنی بڵاوبووەتەوە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٨٧) بڵاوبووەتەوە، بەڵام تا ساڵی (١٩٨٨) لە کەرکوک بووەو ژمارەیەکی تری لە هەولێر لە ساڵی (١٩٩١) بڵاوبووەتەوە.

*** گۆڤاری (بەیان):**
- گۆڤارێکی ڕامیاری و ڕۆشنبیرییە، ئۆرگانی لقی کەرکوکی یەکێتی قوتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستانی عێراق دەری دەکرد بەزمانی کوردی.
- ژمارە (١)ی لە بەهاری (١٩٨٧) دەرچووە، بە قەبارەی (٢٠) لاپەڕە.

*** بڵاوکراوەی (بۆ پێشەوە):**
- بڵاوکراوەیەکی دەسنووس بووە بە شێوەی نهێنی لەلایەن ڕێکخستنەکانی (التیار الشیوعي) لە کەرکوک بڵاوبووەتەوە.
- یەکەم ژمارەی لە ساڵی (١٩٨٩) بە زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوبووەتەوە.

*** گۆڤاری (نوژەر):**
– گۆڤارێکی زانستی و رۆشنبیری و لێکۆڵینەوەیی گشتییە، لەلایەن پەیمانگای تەکنیکی کەلارەوە بە زمانی کوردی دەرچووە.
– یەکەم ژمارەی لە نەوەتەکان دەرچووە.

*** گۆڤاری (بزن):**
– گۆڤارێکی دەسنووسی منداڵانە لەلایەن (عەبدولستار تاهیر شەریف) لە نەوەتەکان بە زمانی کوردی دەرکراوە.

*** گۆڤاری (Kerkuk):**
– گۆڤارێکی رۆشنبیری و سیاسی گشتییە، لەلایەن یانەی رۆشنبیری و هاوکاری تورکمانی عێراقی بە زمانی تورکی لاتینی لە تورکیا دەردەچێت.
– بەرێوەبەری کارگێڕی: (سەباح کەتانە).
– سەرنووسەر: (ئەکرەم بامبوقچی).
– دەستەی نووسەران: (زیاد کۆپرلو، عاکف تۆراڵ، ئیلهام دەروێش، حەسەن ئوزمن، ئاوانی کوران، حوسام کۆپرلو، والتان چەتین).
– ژمارە (١)ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) بە پێوانەی (٢٧×٢٠) سم و بە رەنگاورەنگ دەرچووە.

*** گۆڤاری (بابە گور گور):**
– بڵاوکراوەیەکی مانگانەیە لەلایەن رێکخستنەکانی کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دەرچووە.
– دەستەی نووسەران: (ئەدیب، ئاشتی، رێبوار).
– بەشێوەیەکی مانگانە، بەپێوانەی نیوفولسکاب لە قەڵاچۆلان دەرچووە.
– بەزمانی کوردی، ژمارە (١)ی لە حوزیرانی ساڵی (١٩٩١) دەرچووە.

*** رۆژنامەی (النار الازلية والنصر):**
– ئەم رۆژنامەی لەلایەن راگەیاندنی دەزگای گشتی نەوتی باکوور لە کەرکوك بە هاوبەشی لەگەڵ راگەیاندنی پارێزگای کەرکوك بە زمانی عەرەبی دەرچووە.
– سەرپەرشتی گشتی رۆژنامەکە: (ئەرجومان یونس).
– بەڵگەی تەواومان لەبەردەستا نییە کە لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٩١) یان (١٩٩٢) دەرچووە.

*** رۆژنامەی (کەرکوك):**
– رۆژنامەیەکی سیاسی و ئەدەبی مانگانەیە، لقی چواری پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان بەشێوەیەکی مانگانە بەزمانی کوردی دەریکرووە.
– بە پێوانەی (٣٤،٥×٤٧،٥) سم.
– ژمارە (١)ی لە ئەیلولی ساڵی (١٩٩١) بە (١٦) لاپەڕە دەرچووە.
–ژمارە(٥)ی لە شوباتی ساڵی(١٩٩٢) بە(٨) لاپەڕە دەرچووە.

*** گۆڤاری (بڵێسەی باوەگورگور):**
– گۆڤارێکی رۆشنبیری سیاسییە، لقی کەرکوکی یەکێتی قوتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستان ناوەبەناوە لە چەمچەماڵ بەزمانی کوردی دەریدەکرد، ژمارەی لاپەڕەکانی (٢٨) لاپەڕە بووە.
– تەنها یەك ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) دەرچووە.

*** رۆژنامەی (بابە گور گور):**
– مەڵبەندی (٢)ی رێکخستنی کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەژێر ناونیشانی (کەرکوك قودسی کوردستانە) بە پێوانەی (٣٢×٤٨) سم بەزمانی کوردی.
– ژمارەی (١)ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) بە قەبارەی (٨) لاپەڕە دەرچووە.
– ژمارەی تایبەتی لە (٣١)ی ئابی ساڵی (١٩٩٢) دەرچووە.

*** رۆژنامەی (شۆرشی تابوت):**
– رۆژنامەیەکی تایبەتە کە لەلایەن کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لقی کەرکوك بە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دەرچووە.
– ژمارە یەکی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) بە چوار لاپەڕە بە چاپ گەیەنراوە.

*** رۆژنامەی (رووناکی خوێندکار):**
– رۆژنامەیەکی رۆشنبیری قوتابیانە، لەلایەن کۆمەڵەی قوتابیان و لاوانی لقی کفری بە زمانی کوردی دەرچووە.
– ژمارە (١)ی لە (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) دەرچووە.
– سەرنووسەر: (محەمەد سابیر عەلی).
– دەستەی نووسەران: (عەباس نوری کەریم، جەلال حەسەن حوسێن، لوقمان حەکیم حوسێن).

*** بڵاوکراوەی (زەنگی ئاوارە):**
– بڵاوکراوەیەکە لەلایەن کۆمەڵەی ئاوارەکانی کەرکوکەوە دەرچووە بە سەرپەرشتی (شوان داودی، شاپوور، قابیل، گرفتار کاکەیی).
– یەکەم ژمارەی لە ساڵی (١٩٩٢) دەرچووە، تاوەکو ساڵی (١٩٩٣) بەردەوام بووە.

*** گۆڤاری (پرۆژە):**
– گۆڤارێکی وەرزی بووە لەسەر شێوەی کتێب دەرچووە، کە تایبەت بووە بە رەخنەسازی و لەلایەن کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لقی کەرکوك بە زمانی عەرەبی و کوردی دەرچووە، بە پێوانەی (١٦,٥×٢١) سم.
– ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٩٢) بە قەبارەی (١٧٢) لاپەڕە دەرچووە.
– ژمارە (٢ – ٣)ی لە پاییزی ساڵی (١٩٩٢) بە قەبارەی

(١٨٤) لاپەڕە دەرچووە.
- دەستەی نووسەران: (عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی، محەمەد ئەمین ئەحمەد، سەلاح حەسەن پاڵەوان، جەلیل زەنگەنە، حەمید ڕێبوار، سەدرەددین عارف).

* ڕۆژنامەی (هاواری گەرمیان):
- ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ بووە لەلایەن کۆمەڵێك ئاوارەی ناوچەی گەرمیان لە کەرکوك دەرچووە.
- ژمارە یەکی لە شوباتی ساڵی (١٩٩٢) بە زمانی کوردی بە چوار لاپەڕە بە قەبارەی ناوەندی دەرچووە.
- لەلایەن (شوان داودی)و کۆمەڵێکی تر دەرچووە بەم ناوانە (شاپور عەبدولقادر شکور، قابیل عادل، ئەرکان ڕەنجدەر، مەسعود عەبدوڵڵا).
- تەنها یەك ژمارەی لێدەرچووە.

* ڕۆژنامەی (دەنگی کەرکوك):
- ڕۆژنامەیەکە بە زمانی کوردی، لەلایەن کۆمەڵەی ڕۆشنبیری لقی کەرکوك لە سلێمانی دەرچووە.
- ژمارە یەکی لە (١٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٢) دەرچووە.

* گۆڤاری (چەرموو):
- گۆڤارێکی ڕۆشنبیری کوردییە، کۆمەڵەی خوێنکاران و لاوانی کوردستان، کۆمیتەی چەمچەماڵ ناو بەناو دەریدەکرد.
- تەنها دوو ژمارەی لێدەرچووە، قەبارەی بچووك و بە ڕۆنیۆ بە ڕەش و سپی چاپکراوە.
- ژمارە (١)ی لە تەمموزی ساڵی (١٩٩٢) دەرچوو.
- ژمارە (٢)ی لە ئابی ساڵی (١٩٩٢) دەرچووە.
- سەرنووسەر: (عارف قوربانی).
- سکرتێری نووسین: (ئەنوەر عومەر).

* بڵاوکراوەی (زەنگی ئاوارە):
- بڵاوکراوەیەکە لەلایەن کۆمەڵەی ئاوارەکانی کەرکوکەوە بە زمانی کوردی دەرچووە.
- سکرتێری نووسین: (شوان داودی).
- ژمارە (١)ی لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) دەرچووە بە چوار لاپەڕەو تەنها سێ ژمارەی لێ دەرچووە.

* بڵاوکراوەی (مەشخەڵی ئیمان):
- بڵاوکراوەیەکی گشتی ئیسلامییە، لەلایەن کۆمەڵێك لاوی بزوتنەوەی ئیسلامی لە چەمچەماڵ دەرچووە.
- ژمارە (١)ی لە ساڵی (١٩٩٣) بە زمانی کوردی و تەنها دوو ژمارەی لێ دەرچووە.

* ڕۆژنامەی گەڕانەوە):
- ڕۆژنامەیەکی ناوبەناوەی سیاسی و ڕۆشنبیری گشتی بووە.
- لەلایەن کۆمەڵەی ئاوارەکانی کوردستان ناوەندی کەرکوك دەرچووە.
- ژمارە (١)ی لە (٢٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٣) بە زمانی کوردی دەرچووە.
- سەرنووسەر: (مەلا بەکر ئیسماعیل).
- بەڕێوەبەری هونەری: (عەدنان گلی).

* ڕۆژنامەی (الابداع):
- ڕۆژنامەیەکی تایبەت بووە بە (المهرجان القطري للفنون المسرحية والأدبية والموسيقية للمنطقة الاولى)، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوك (التاميم) لە چالاکی قوتابخانەکان بە زمانی عەرەبی دەرچووە.
- ژمارە یەکی لە (١٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٣) بە دوو لاپەڕەی قەبارە گەورە دەرچووە.
- سەرنووسەر: (دەروێش لەفتە ئەلئەجوەدی).
- دەستەی نووسەران: (فازل محەمەد حەلاق، مؤید ئەحمەد، سالم مەحمود، کامل ئەلعامری).

* ڕۆژنامەی (تورکمن ایلی):
- ڕۆژنامەیەکی سیاسی گشتی هەفتانەیە، لەلایەن بەرەی تورکمانی عێراقییەوە بە زمانی تورکی و عەرەبی دەرچووە.
- ژمارە (١)ی لە (٢٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٤) لە هەولێر دەرچووە، بەڵام لە ژمارە (٧٧٧) کە لە تەمموزی ساڵی (٢٠٠٥) بە قەبارەی (١٢) لاپەڕە دەرچووە گوازراوەتەوە بۆ کەرکوك و تاوەکو ئێستاکە بەردەوامە.
- سەرنووسەر: (نەجات کەوسەر).
- بەڕێوەبەری نووسین: (حەسەن کەوسەر).
- سکرتێری نووسین: (ئایدن کەرکوك).

* ڕۆژنامەی (العبور):
- ڕۆژنامەیەکی ناوە بەناوەی عەرەبی بوو لەلایەن سەندیکای مۆسیقای عێراقی، لقی کەرکوك دەردەچوو، بەهۆی میهرەجانی (العبور للاغنية الشمالية)، تەنها سێ ژمارەی لێدەرچووە.
- ژمارە یەکی لە ئایاری ساڵی (١٩٩٥) دەرچووە.
- هەر یەکە لە (فازل محەمەد حوسێن حەلاق)و (بەهجەت مەردان غەمگین) دەوریان لەدەرچوونیان هەبووە.

بەغدا بەبیانووی هەبوونی نووسەرانی شاخەوە دایبخات. یەکێتیی نووسەرانی کوردستان ئەندامێتی هەموو بەشەکانی کوردستانی دەگرتەخۆ هەر بەو مەبەستەش ئەو ناوەی لێنرا تا بەلای کەمەوە لە ڕووی مەعنەوییەوە سنوورە دەستکردەکان ببەزێنێت. ئێمە لەناو یەکێتیی نووسەرانی کوردستاندا، شاری کەرکوکمان بە مەغدورتر دەزانی، بە حکومی ئەوەی، لە هێڵی پێشەوە بوو دوژمن زیاتر دەستی بەسەر کەرکوکدا دەڕۆیشت، وەك لە شارەکانی تر. بیرمان لەوە کردەوە شتێك بۆ ئەو شارە بکەین، هەر هیچ نەبێت بایەخێکی ڕۆشنبیری بۆ شاری کەرکوك هەبێت، جا بە دوو - سێ کەس، بەوەزعی ماددی نالەباری چیاو چۆڵ، بەژمارەیەکی زۆر کەمی نووسەرەوە چ دەکرا؟ ئەوپەڕی دەمانتوانی گۆڤارێکی متەوازع دەربکەین، بەو ئیمکاناتە کەمەی هەبوو. تەنانەت شۆڕشیش ئیمکانیاتێکی ئەوتۆی نەبوو، بە دەیان پێشمەرگە هەبوون، چەکیان پێ نەبوو، دواتر بڕیاری دەرکردنی گۆڤارێکمان دا، پێشتر بڵاوکراوەیەکی تاك ژمارە بەناوی گزنگ لە شاری کەرکوکدا هەبوو، کە تەنها یەك ژمارەی لێدەرچووبوو داخرابوو هەر بۆ تەحەداکرنی ڕژێم و بەمەبەستی درێژەدان بە بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی لە شاری کەرکوك، بڕیارماندا درێژە بە گۆڤاری گزنگ بدەین، لەجیاتی ئەوەی لە ژمارە (سفر یان ١) دەستپێبکەین، لە ژمارە دووەوە دەستمانپێکردو ژمارە دووی گزنگمان لە توژەڵە لەلای برادەرانی ڕاگەیاندنی ی. ن. ك بە چاپمان گەیاند. ژمارە دوومان لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نووسی، هەر لەسەر بەرگەکەی نووسیمان گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کوردستان - لقی کەرکوکە. بەڵام ناوی سەرنووسەرو ستاف گۆڤارەکەمان بڵاونەکردەوە. بەندە ئەرکی سەرپەرشتیکاری گشتیو ڕۆشنبیریم گرتە ئەستۆ. هەروەها هەرچی ئەرك‌و کاری تایپ‌و چاپکردن‌و هاتوچۆ بۆ ئەم دێ‌و ئەو دێ بۆ تەکلیف لەم حیزب‌و لەو حیزب تا گۆڤارەکە چاپ بکرێ‌و دەربچێت، کاك ئەحمەد عارف جێبەجێی دەکردن‌و ڕایدەپەڕاندن. لە ڕووی عەمەلییەوە ئەو هەمەکارەی گۆڤارەکە بوو، هیممەت‌و وورەبەرزی ئەو نەبوایە گۆڤارەکەمان بۆ دەرنەدەچوو.

سەبارەت بەکۆکردنەوەی بابەتەکان لە ڕێگەی پەیوەندی شەخسییەوە بە نووسەرانی ناوشارو شارۆچکەکان بابەت پەیدا دەکران. ئیدی بە گوێرەی تواناو بەناوی خوازراو بابەتمان بۆ دەهات‌و ناوە خوازراوەکانیش لەلای هەموومان ئاشکرا نەبوون. هەریەکەمان چەند ناوێکمان دەناسی.

هاوکاری ئەوان بۆ ئێمە شتێکی باش بوو، بەڵام سووربووین لەسەر ئەوەی ئەگەر هیچ کەسێکیش هاوکاریمان نەکات، ئێمە گۆڤارەکە هەر دەربکەین. تەنانەت ئەگەر ٤ لاپەڕەش بێت. چونکە دەلالەتێکی مەعنەوی سیاسی ڕۆشنبیری - مێژوویی بۆ ئێمەو کوردستانییەتی کەرکوك هەبوو. بە خۆشحاڵییەوە گۆڤاری گزنگ لەساڵی (١٩٨٢)دا دوای دە ساڵ پاش داخستنی یەکەم ژمارەی لەناو شاری کەرکوك، لە چیاداو لە بەرگی پێشمەرگەدا دەرچۆوەو هەتا ئێستاش ماوەو دەردەچێ. ئەو درێژەدانەی ئێمە بە گۆڤارەکەماندا، خۆشبەختانە بەردەوامەو حاڵی حازر ئەوەندەی من ئاگاداربم ژمارە ١٠٦ی لە بازاردایە.

بەشێوەیەکی گشتی ژمارەی لاپەڕەی هەر ژمارەیەك ١٠٠ تا ١٢٠ لاپەڕەی نیوفولسکاب بوو، هەڵبەتە ئەمە زیاتر لەبەر نالەباری باری دارایی‌و زەحمەتی پەیداکردنی کەرەستەو پێویستی چاپ‌و چاپکردنی گۆڤارەکە بوو، هیچ ژمارەیەکی نە لە ٢٠٠ نوسخە کەمترو نە لە ٦٠٠ نوسخە زیاتر نەبوو. خوێنەری سەرەکی گۆڤارەکە جەماوەری هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوون، لە نێو پێشمەرگەو کادراندا دەستاودەستی دەکرد. هەروەك دەگەیشتە ناوچە جیاوازەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەو لە ڕێگای خۆیانەوە دەیانگەیاندە ناوشارو شارۆچکەکان. هەندێکجاریش چەند کتێبفرۆشێکی ناوشارەکان بەنهێنی‌و بەدزییەوە دەهاتنە شاخ‌و هەندێ ژمارەی گزنگ‌و بڵاوکراوەکانی تریان دەبردە ناوشارو لەوێندەر بەنهێنی کۆپییان دەکردەوەو دەیانفرۆشتنەوەو بەو جۆرە لە شارەکاندا بڵاودەبووەوە.

نا، بەتایبەتی من، کە هیچ وابەستەگییەکی حیزباتیم نەبوو، بەهەر حاڵ بەهەموو شێوەیەك دەگەیەنرا.

ڕێکخستنەکانیش لەگەڵ بڵاوکراوەکانی خۆیاندا، بڵاوکراوەکانی نووسەرانیشیان دەگەیاندە ناوشار. هەروەها بەهۆی ئەو گەنجە کتێبفرۆشانەشەوە لە شارەوە بەنهێنی هاتوچۆی شاخیان دەکرد دەگەیەنرایە شارو شارۆچکەکان‌و کۆپییان دەکردەوەو بە نهێنی لە شاردا دەیانفرۆشت. پەیوەندییەکی باش لەنێوان ئێمەی شاخ‌و گەلێك لە نووسەران‌و خوێنەرانی شاردا هەبوو زۆر جار لە ڕێگای ئەو کتێبفرۆشانەوە بابەتیان بۆ دەناردن. لەو کتێبفرۆشانەی دەهاتنە لامان‌و بابەتی هەندێ لە نووسەرانیان بۆ دەهێناین لە شاری سلێمانی "یوسف تەها" ساڵح مەحمود خاکی بوون.

بابەتەکانی ئەو ژمارەیە بریتیبوون لە " لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، شیعر، چیرۆك، دەق" زیاتر بابەتی شیعرو کورتە چیرۆك‌و دەقی دیکە بڵاودەکرانەوە، چونکە ناردنی لێکۆڵینەوە لەلایەن نووسەرانی شارو شارۆچکەکانەوەو ناردنی بۆ شاخ نارەحەت‌و زەحمەت بوو، بۆیە زیاتر بابەتی شیعرو چیرۆکمان بۆ دەهات، ئەوانە کورت‌و لاپەڕەکانیان کەم بوو، زۆربەی بەرهەمەکان لە چوارچێوەی ئەدەبی بەرگریدا بوون. جاری واش هەبوو، ئێمە خۆمان بە بابەتێك زیاتر بەشداریمان دەکرد، بابەتێکمان بەناوی خۆمان‌و یەکێکی ترمان بەناوێکی خوازراو بڵاودەکردەوە. تا هەمەجۆری‌و هەمەڕەنگییەك لە بابەت‌و ناوەکاندا هەبێت. زیاترش لە زمانی عەرەبی‌و فارسییەوە بوون، لە هەموو ئەو ژمارانەی لە شاخ دەرچوون، مەگەر بەدەگمەن دەنا بابەتی وەرگێڕدراو لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە نەبوو.

پێش دەستپێکردنی سووکە گفتوگۆیەکەی ساڵی (١٩٨٣)ی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و ڕژێمی بەعس، ژمارە ٣ لە گوندی هەڵەدن دەرچوو. ئەوکاتە ڕژێم هێشتا قوتابخانەکانی ناوچەو شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش‌و هێزی پێشمەرگەی دانەخستبوو، مامۆستاو فەرمانبەران دەوامی خۆیان دەکرد، قوتابخانەکەی هەڵەدنیش مابوو،

بەشێکی مەکتەبی ڕاگەیاندنی " ی. ن. ك" لەوێ بوو، ئێمە ئەو ژمارەیەی گزنگمان لەوێ بە چاپ گەیاند.

ئەو ژمارەیەش ستاف نەبوو، تاکو گەیشتینە ژمارە ١٦، ئینجا ستافمان بۆ دانا، پێمانوابوو، کە هەموومان ماندووین‌و هەموومان بەیەکەوە ئیش دەکەین، هەستمان بەوە نەدەکرد یەکێکمان لەوی تر ماندووترە یان ئیمتیازی زیاترەو دەبێ ناوی بنووسرێ، بەڵام بەزارەکی ڕێکەوتین، کە من سەرپەرشتیکارو سەرنووسەری گۆڤارەکە بم، سەبارەت بە تایپیست زۆربەیان لە ڕاگەیاندنی یەکێتی بوون، هەندێکجاریش تایپیستی حیزبی دیموکراتی کوردستان – ئێران هاوکاریان دەکردین. بۆ مێژوو دەیڵێم، تایپیست‌و برادەرانی ئیعلامی حیزبی دیموکرات زۆر بێ قسور بوون لەگەڵماندا، جگەلەوانەش پاسۆك‌و حیزبی شیوعی عێراق‌و هەندێ لایەن‌و گروپی دیکەی سیاسی ئێرانی هاوکارییان دەکردین، زۆرجار چەندین بەند کاغەزو مەوادی تریان بۆ دەهێناین، کە بەندێکی کاغەز بە ٦٠٠ تا ٧٥٠ فلس بوو، زۆرجار پارەیان لێوە نەدەگرتینەوە، کە ئەو بەندانە بەشی دەرکردنی گۆڤارێکی دەکرد. جاری واهەبوو، دەچوونە ژێرباری دەرکردنی یەك ژمارەی گۆڤارەکەو ئەرکی هەموو تێچوونەکەیان دەکێشا.

لەساڵی (١٩٨٣) هاتینە ناوچەی جافایەتی‌و دۆڵە ڕووت، لە بەرگەڵو، مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی چەند ژمارەیەکی گۆڤاری گزنگیان بۆ چاپکردین. دواتر چاپخانەیەکی شرمان دانا، کە تەنها ڕۆنیۆو تایپێك بوو، ناومان نا "چاپخانەی شەهید عەبدولخالق مەعروف"، کە تایبەت بوو بەنووسەران، جگە لە گۆڤاری گزنگ، بەشێك لە بڵاوکراوەکانی ترمان لەوێ چاپ کرد. بەگشتی ١٥ ژمارەی گۆڤاری گزنگ لە شاخ دەرچووە.

لە ژمارە ٤ تا ٦، لە گوندی سەرگەڵو دەرچووە، لە ژمارە ٧ تا ١٥، کە دوا ژمارەی سەردەمی شاخە، لە گوندی یاخسەمەر دەرچووە. هەروەها سێ ژمارەی "گزنگی بچووکان"یش هەر لە گوندی سەرگەڵو دەرچوون. ئەو سێ ژمارەیەی گزنگی بچووکان بە ڕۆنیۆو لە چاپخانەکەی خۆمان (نووسەران) چاپکراون، کە ئەوسا یەکێتیی نووسەرانی کوردستان بارەگایەکی هەبوو لە سەرگەڵو، کە بریتیبوو لە دوو ژووری مزگەوتەکەی سەرگەڵو، کە کاتی خۆی حوجرەی فەقێیان بوو، هەم شوێن‌و بارەگای ئێمە هەرسێکمان (ڕەحمەتیی محەمەد موکری، ئەحمەد عارف‌و بەندە)و هەم شوێنی چاپخانەکەش بوو، جا ئێمەش وەکو فەقێ چووبووینە ئەوێ‌و ئیشمان دەکرد.

ئەو ژمارەیە لە کۆتایی (١٩٨٧) یان سەرەتای (١٩٨٨)، کە هێشتا شاڵاوی بەدناوی ئەنفال دەستپێنەکردبوو، لە گوندی یاخسەمەر چاپکراو دەرچوو، چونکە لەبیرمە دوای ئەو ژمارەیەی گزنگ، لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨)، ژمارە (١)ی گۆڤاری کەلتوورمان چاپکردو دەرکرد. دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)، کە گەڕاینەوە ناو شارەکان، ژمارە (١٦و ١٧)ی گزنگ مان لە شاری سلێمانی دەرکرد، بەڵام بەهەمان فۆرم‌و نەفەس‌و درێژەی ژمارەکانی شاخ بوون، هەر بە ڕۆنیۆش چاپکران. لەو دوو ژمارەیەدا ناوی سەرنووسەرو ستافەکەی نووسرا، من سەرنووسەری گۆڤارەکە بووم، کە ئێستا ناوی ستافەکەم بەباشی نایەتەوە یاد.

بەهۆی کەمی‌و زەحمەتی پەیداکردنی کەرەستەو مادەی چاپکردن‌و نارەحەتی بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە، نەماندەتوانی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بە چاپی بگەیەنین، بەڵکو ناوبەناو دەردەچوو. لە ڕووی بابەت‌و نووسینەوە، پەکمان نەدەکەوت، لەناو شارو شارۆچکەکان‌و لە دەرەوەی کوردستانیش هاوکاری دەکراین، چونکە ژمارەکانی گۆڤارەکەمان بۆ دەرەوەی کوردستان‌و ئەورووپا دەنارد، کە چەند دانەیەکمان بەتایبەت بۆ خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەد دەنارد. ئەویش لەوێ گۆڤارێکی بەناوی "چریکە" دەردەکرد لە بیرمە زۆرجار بابەتی لە گزنگەوە وەردەگرت‌و بە ئاماژەدان بەوەی لە گزنگی وەرگرتووە، لە گۆڤارەکەیدا بڵاویدەکردەوە لە بیرمە لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری گزنگەوە شیعرێکی کاك ئەحمەد عارفی دەرهێنابوو، لە چریکە دا بڵاویکردبۆوە. لەدوای ڕاپەڕین، کە ئەو دوو ژمارەیەمان دەرکرد، ئیدی بەهۆی شەڕی ناوخۆو شەڕی براکوژییەوە، نووسەران بە هەموو لقەکانییەوە لە چالاکی وەستان، گزنگ دەرنەچوو تا ساڵی (٢٠٠٤)، ئەوسا یەکێتیی نووسەرانی کورد – لقی کەرکوك بەئامادەبوونی دەستەی بەڕێوەبەری هەموو لقەکانی دهۆك، هەولێر، سلێمانی‌و سکرتێری ئەوسای یەکێتیی نووسەرانی کورد پرۆفیسۆر د. عیزەدین مستەفا ڕەسول‌و بەرپرسی زۆربەی لقەکان، کۆنفرانسی خۆی لەناو شاری کەرکوك بەست. ١٣٨ ئەندام بەشداری تێدا کرد. تەنها ١٠ کەسێك بەشدارییان تێدا نەکرد.

بەندە بە هەڵبژاردن بوومە بەرپرسی لقی کەرکوکی یەکێتیی نووسەرانی کورد. ئیتر دەستمانکردەوە بەدەرکردنی گۆڤاری گزنگ، ژمارە (١٨)مان لە کەرکوك بەچاپگەیاند، هەتا ژمارە ٨٤ سەرنووسەری بووم. ئەو ژمارانەی لەو قۆناغەدا دەرچوون، ژمارەی باشن‌و دەکرێ ببنە سەرچاوەو بەڵگەی کاری چاپەمەنی‌و ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و مێژوویی شاری کەرکوك، کە هیچ گۆڤارێك نییە بەوشێوەیە دەرچووبێ‌و هەتا ئێستا بەردەوام بێت. هەروەها تیراژی زۆربەی ژمارەکانی لە ١٠٠٠ دانە کەمتر نییە. حاڵی حازر ژمارە (١٠٦)ی گۆڤاری گزنگ لە بازاردایە. ئەوکاتە هەندێ بابەتی تایبەت بە منداڵانمان بۆ دەهات، پێمانوابوو تێکەڵکردنیان لەگەڵ گۆڤاری گزنگدا، دەیانشارێتەوەو وەك ئاردی ناو درکی لێدێت. بۆ ئەوەی ئەو بابەتانە نەفەوتێن، بڕیارماندا لە دووتوێی نامیلکەیەکدا کۆیان بکەینەوەو ناومان نا گۆڤاری بچوکان"، تیکرای ئەو بابەتانەی تێیدا بڵاودەکرانەوە، بە شیعرو چیرۆك‌و ئەوانی تر، هەر هەمووی بۆ منداڵان بوو، تەنها توانیمان ٣ ژمارەی لێ چاپ بکەین، کاك ئەحمەد عارف سەرپەرشتی دەکردو هەندێ برادەرو هاوڕێی دیکەش هاوکارییان دەکردین، لەوانە پێشمەرگەی شێوەکار ڕەمزی قوتبەدین، بۆ دیزاینی بەرگ‌و ناوەوەو مۆتیڤەکان زۆر یارمەتی دەدایین. ناوبراو یەکێك بوو لە کەسە خاکییەکان‌و کوردێکی پاك‌و نیشتمانپەروەر بوو، دڵی زۆر بەبزووتنەوەی

ڕۆشنبیری و ئەدەبی خۆش بوو، هونەرمەندو شێوەکارێکی ناسك بوو، حەزی لەو جۆرە ئیشانە دەکرد.

جگە لەو، د. ڕێبوار سەعیدیش، زۆر یارمەتی دەداین و وێنەو مۆتیڤی بۆ هەموو بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەران دەکێشا. هەروەها هونەرمەندی شێوەکار کاکە ئەردەڵانیش. هەموو ئو برادەرانەی لەوێ بوون، پێشمەرگانە ئەرك و کارەکانیان جێبەجێ دەکرد پێشمەرگەش زۆر بەتامەزرۆیی پێشوازیان لە گۆڤارو بڵاوکراوەکانمان دەکردو لە سنوورو ناوچەکانی خۆیاندا بانگەشەو ڕیکلامیان بۆ دەکرد. زۆرجار کتێب یان بڵاوکراوەیەك لەژێر چاپکردندا بوو، هێزی پێشمەرگە دەیانزانی شتێکی وا هەیە، بۆیە کە دەهاتنە سەرەوە هەواڵی دەرچوون و دەرنەچوونیان دەپرسی. تەنانەت کە هاتنە سەرەوە زۆرجار پێشمەرگە لەلای ئێمە دەمانەوە. بارەگای ئێمە (نووسەران) دەرگای واڵابوو بۆ هەموو کەسێك، چونکە نە حیزبایەتی تیا بوو نهێنی حیزبێنی. بەئەکیدی پاڵپشتییەکی ماددی و مەعنەوی زۆرباش هەبوو، ئەگەر ئەوە نەبوایە نەماندەتوانی بەردەوام بین.

وێنەیان تێدا بوو، ئەوانەی بەشدارییان تێدا دەکرد، نووسەری بێلایەن بوون، ئەندام و کادری ڕاگەیاندنەکان نەبوون، بەڵام بەهیچ جۆرێك ڕاگەیاندن و برادەرانی ڕاگەیاندن ئێمەیان لە خۆ جیا نەدەکردەوە. ئەوە نەبوو ماڵ جیاییمان لەگەڵدا بکەن، جاری وابوو ئیشی خۆیان ڕادەگرت بۆ ئیشی ئێمە. هاوکاری ئەوان نەبوایە هەرگیز نەماندەتوانی بەردەوام بین. بەپێی توانا هاوکاری ماددی و مەعنەویان دەکردین. بەحوکمی لکاندنی ناوی کوردستان بەڕێکخراوەکەمانەوە، زۆربەی لایەن و حیزبە سیاسییەکانی کوردستان هاوکارییان دەکردین، ئێمەش بەو نەفەسە دەجووڵاینەوەو جیاوازیمان لەنێوانیاندا نەدەکرد. ئێمە هەموو حیزب و لایەنەکانمان بە شۆڕشگێڕ دەزانی و هەریەکەی بەشێوازی خۆی خەباتی پێشمەرگایەتی دەکرد، ئێمەش ئەوەمان قبوڵ بوو. وێنەکانی یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری گزنگی بچووکان لەلایەن کوڕێکی خەڵکی کۆڕیای باشوورەوە کە هێزی پێشمەرگە لە کارخانەی چیمەنتۆی سلێمانی ڕفاندبوویان، کێشرابوو ناوی مستەر (لی) بوو، بەقسەی خۆی ئەندازیار بوو.

لە گزنگدا نەمان بوو، ئەویش بەهۆی نەبوونی کەرەستەو پێداویستی بۆ دۆسێ و تەوەری تایبەت، بەڵام لەکاتی دەرچوواندنی گۆڤاری کەلتوور، کە خواڵێخۆشبوو محەمەد موکری سەرنووسەری بوو، منیش بەڕێوەبەری نووسین بووم، کاك فەرید ئەسەسەردیش ئەندامی دەستەی نووسەران بوو، کە توانیمان تەنیا ٤ ژمارەی لێ چاپ بکەین. ژمارەی لاپەڕەکانی لەنێوان ٣٠٠ تا ٤٠٠ لاپەڕەی فولسکاب بوو، کۆمەڵێك بابەتی وەرگێڕدراوی هەبوو، دۆسێ و تەوەری تایبەتیشی هەبوو. دەتوانم بڵێم گۆڤاری کەلتور یەکەمین گۆڤاری کاروانی ڕۆژنامەوانی کوردییە، کە تا ئەوکاتە بەو قەبارەیە دەرچووبێ و ئاوا دەوڵەمەند بێت لە ڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە. بەخەتێکی ورد تایپ دەکراو لە هەموو ژمارەیەکدا یەك دانەی، بەلایەنی کەم ٣٠ دیناری عێراقی ئەوسای تێدەچوو. هیچ ژمارەیەکی نەبوو، کە ١٠ کتێبی هەڵبژاردەی تێدا بڵاونەکرێتەوە.

لە قۆناغی شاخدا هیچ بابەتێکی عەرەبیمان بڵاونەکردەوە، لە ژمارە (١٦و ١٧)دا، کە لەدوای ڕاپەڕین لە شاری سلێمانی چاپمان کردن، لەو دوو ژمارەیەدا بەشێکی بابەتەکانی بەعەرەبی بڵاوکراونەتەوە.

هەموو ژمارەکانی وەکو یەك بوون و بەقەبارەی لاپەڕەی نیوفولسکاب دەردەچوو. هیچ جۆرە لۆگۆیەکی لەسەر دانەنرابوو. تەنها نووسرابوو. گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کوردستان - لقی کەرکوکە.

ناوی هەندێکیانم لە بیرەو داوای لێبوردنیش لەوانە دەکەم، کە ناویانم لەیادچووە. ڕەنگە ئەگەر ژمارەکانی گزنگ ببینمەوە، بێنەوە یادم. لەوانە:-

١-خواڵێخۆشبوو شێرکۆ بێکەس، پێش ئەوەی بێتە شاخ بەناوی خوازراوی (جوامێر) دەینووسی.

٢- عەبدوڵڵا سەڕاج، بەناوی خوازراوی (م. ش. ك) دەینووسی.

٣- ڕەئوف بێگەرد، بەناوی خوازراوی (ڕێبوار) دەینووسی.

٤- ئازاد عەبدولواحید یەك بابەتی هەیە بەناوی خوازراوی (تەوار) نووسیویەتی.

٥- حەمە فەریق حەسەن، بەناوی خوازراوی (پشتیوان) دەینووسی.

٦- ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، بەناوێکی خوازراو بابەتی بۆ دەناردین، ئێستا لەیادم نەماوە.

٧- مەهاباد قەرەداغی، وابزانم بەناوی خوازراوی (ژاڵە) دەینووسی.

لە شاخدا بەهۆی یەك ڕستەی ناو چیرۆکێکەوە، کە لەلایەن برادەرێکی ناو شارەوە بۆمان هاتبوو، ناوەڕۆکەکەی بەدڵی یەکێك لەبەرپرسانی حیزبێك نەبوو - کە هەڵبەتە گۆڤارەکەی ئێمە نە لە دوورو نە لە نزیك پەیوەندی بە هیچ حیزب و گروپێکی سیاسییەوە نەبوو - یەکێتی هیچ هاوکاری نەکردین و چیتر گزنگ یان بۆ چاپ نەکردین، بەڵام ئێمە بڕیارماندا بەردەوام بین، بەیارمەتی و هاوکاری ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، کە لە کوردستاندا هەبوون بەچاپی بگەیەنین بۆیە بڕیارماندا مانگانە دەری بکەین، ئەوەبوو چەند ژمارەیەکی کەممان بەوشێوەیە دەرکرد، پاشان بەهۆی شاڵاوی ئەنفالەوە دەربەدەرو ئاوارەی دیوی ئێران بووین، نەمانتوانی بەردەوام بین، تا لە ساڵی ٢٠٠٤دا گزنگ جارێکی دی بە شاری کەرکوك شاو شکور بووەوەو تا ئێستاش بەردەوامە، هیوادارام گزنگ جارێکی دی ئاوارە نەبێتەوە!.

*سەرچاوە:-

-ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٦٩٢٦)، ساڵی ٢٠١٦، لاپەڕە (١٨- ١٩).

*** بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنووسی کوردی لە کەلار (١٩٩١- ٢٠١١).**

سەباح عەلی جاف

کەلار یەکێکە لە شارە گرنگەکانی گەرمیان‌و کوردستانی باشوور، لەڕووی مێژووو شوێنەوارەوە، بۆ خۆی خاوەنی ڕابردوویەکی گەشە، بەو پێیەی چەندین شوێنەوارو سەرچاوەی کۆنی تێدا دۆزراوەتەوەو گەواهی دیرۆکی ئەم شارە دەدەن، هەندێکیان مێژووەکەیان بۆ پێش زایین دەگەڕێتەوەو هەندێکی تریان بۆ سەردەمی ساسانی‌و هاتنی ئیسلام‌و پاشتر.

لە مێژووی نوێ‌و هاوچەرخشیدا کەلار بەپێی سەرچاوەکان ئاوەدان کردنەوەی بۆ سەدەی ١٨ دەگەڕێتەوەو لێرە بەدواوە وورده وورده گەشەی کردووە بەتایبەت دوای ئەوەی کە بەگزادەی جاف توانیان گەشە بە گوندی (کەلاری کۆن) بدەن، کە ئێستا گەڕەکێکی گەورەی شارەکەیە، لە ساڵی (١٩٣١) یەکەم قوتابخانە لە کەلار دەکرێتەوە، ئەمەیش دەبێتە هۆی زیاتر گەشانەوەی لایەنی ڕووناکبیری کەلار، بە جۆرێك ئەم قوتابخانەیە چەندین منداڵی پێگەیاندووەو لە بواری ڕووناکبیری‌و ڕاگەیاندندا ڕۆڵییان هەبووە.

لە پاش ئەوەی بە بڕیارێکی کۆماری کەلار لە (٢٨ی شوباتی ساڵی ١٩٧٠) دەبێتە قەزا، بەمەش زیاتر گەشە دەکات، کاریگەریی لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکان هەبووە بەتایبەتی کایەی مەعریفی، لە سەردەمی بە قەزابوونی کەلاردا، چەندین کەس کاری ڕاگەیاندیان کردووە و لەو ڕووەوە ناویان دیارە، بەڵام لە پاش ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستان لە بەهاری (١٩٩١) زیاتر ئەم شارە بەرەو پێش دەچێت، یەك لەو لایەنانە بواری ڕاگەیاندن‌و ڕۆژنامەوانییە، بە تایبەت ڕۆژنامەنووسی، کە هەر لە سەرەتاکانی ڕاپەڕیندا یەکەمین بڵاوکراوە، لێرەوە دەردەچێت بە ناوی (میلکان)، قۆناغ بە قۆناغ کاروانی ڕۆژنامەنووسی لەم شارەدا زیاتر چڕۆدەکات بە شێوەیەك ساڵانە ژمارەی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی بە تەواوەتی زیاتریکردووە.

لەم بیبلۆگرافیەدا من هەوڵمداوە بەپێی توانا لە ماوەی ساڵانی (١٩٩١- ٢٠١١) ئەوەی کە دەستکەوتووە بە تەواوی (٦١) بڵاوکراوەم کۆکردووەتەوەو هەوڵمداوە لێرەدا بیخەمە ڕوو، بە هیوام ئەم کارەی من سەرەتا بێت لەم ڕووەو هەر بڵاوکراوەیەکی تر لەو مێژووەدا هەبێت بخرێتە ڕوو، چونکە دڵنیام کە بڵاوکراوەی تر هەبووەو ڕەنگە من دەستم نەکەوتبێت، بۆیە دەکرێت ئەم کارە درێژەی هەبێت، من ئەم کارە بۆ خۆم زۆر بە پیرۆزی دەزانم وە ناوم لێدەنێم (بیست ساڵ خەباتی قەڵەم لە کەلار)، سەرباری کارکردنم لەو بوارەدا هەندێك تێبینی‌و سەرەنجم لا گەڵاڵە بوو، کە لێرەدا دەیخەمە ڕوو، وەك بەرچاو ڕوونی بۆ خوێنەران‌و ئەوانەی لە داهاتوودا لەم ڕووە کارە دەکەن:-

١- لە کەلار لە سەروبەندی ڕاپەڕیندا، یەکەم بڵاوکراوەی کوردی تێیدا دەرچووبێت بە ناوی (میلکان) کە ژمارە سێ لە سەرەتای مانگی تەموزی ساڵی (١٩٩١) دەرچووە، من تەنها ئەو ژمارەیەم دەستکەوت، واتە ژمارە یەکی ئەو بڵاوکراوەیە پێشتر دەرچووەو ڕەنگە ژمارەی زیاتریشی لێ بڵاوکرابێتەوە، بەم شێوەیە دەردەکەوێت لە کەلار یەکەمین بڵاوکراوەی کوردی لە دوای ڕاپەڕین لەم شارەدا دەرچووە.

٢- سنووری بیبلۆگرافیا کە بریتییە لە سنووری قەزای کەلار بە هەر دوو ناحیەی (پێباز، ڕزگاری) واتە سنووری کارکردن لەم ڕووە دیارە، بە هەمان شێوە لە سەرەتای ساڵی (١٩٩١) تا کۆتایی ساڵی (٢٠١١) هەر بڵاوکراوەو ڕۆژنامەو گۆڤارێك دەرچوبێت‌و بەردەستکەوتبێت لێرەدا خراوەتە ڕوو.

٣- هەندێك لەو بڵاوکراوو ڕۆژنامانە بە ناوی گەرمیان، یان بە ناوی شوێنی ترەوە دەرچوون، بە تایبەت لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە بڵاوکراونەتەوە، بۆ نموونە هەبووە لەسەری نووسراوە لەلایەن (لقی خانەقین)ەوە دەرچووە، لە کاتێکدا ئەو شارە لە کاتی ڕاپەڕیندا بۆ ماوەیەکی کەم ئازادکراو جارێکی تر لەلایەن بەعسەوە دەستی بەسەردا گیراوەتەوە، ئەو بڵاوکراوانە لە کەلار کاریان بۆ کراوەو زۆریشیان هەر لێرە بڵاوکرانەتەوەو لەم شارەدا دەرچوون، بۆیە لەسەر کەلار حیساب دەکرێن.

٤- هەندێك لە بڵاوکراوەکانی سنووری کەلار، تەنها یەك ژمارەیان لێ دەرچووەو وەستاون، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ زۆری تێچوونی لایەنی ماددی.

٥- هەندێك لە بڵاوکراوەکان (مێژووی دەرچوون) ڕوون نییە، بەتایبەت لە ژمارەیەکی ئەو بڵاوکراوەیەدا نەنووسراوە کەی دەرچووە، هەر بۆیە لەم ڕووە کەم‌و کورتی بەدیدەکرێت، بۆ ئەمەش پشت بە زانیاری کەسەکان بەستراوە، یان لە ژمارەی دواتری ئەو بڵاوکراوەدا نووسراوە کە یەکەم ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیە کەی دەرچووە.

٦- بەشێك لە بڵاوکراوو ڕۆژنامەکان، بە شێوەیەکی ڕێکوپێك‌و خولی دەرنەچوون، ئەمەیش بە گرفت دادەنرێت، بە نموونە ڕۆژنامەیەك یان بڵاوکراوەیەك کە لەسەری نووسراوە مانگانە دەردەچێت، کەچی ژمارەکانی بە ڕێکوپێکی بە دوای یەکدا دەرنەچوون، واتە بە شێوەیەکی خولی ڕێکوپێك نەبووە.

٧- بەشێك لە بڵاوکراوەکان ناوی ستاف لەسەر نییە، یان لەم ڕووە تێکەڵ‌و پێکەڵییەك بەدیدەکرێت، بە تایبەت ئەو بڵاوکراوانەی لەسەرەتای ڕاپەڕیندا دەرچوون ناوی کەسیان وەك ستاف لەسەر نییە.

٨- قەبارەو سایزی بڵاوکراوەکان جۆر بە جۆرن، واتە هەندێکیان زۆر بچووك، مامناوەند، یان گەورەن، هەر بۆیە لەڕووی قەبارەوە بڵاوکراوەکان جۆربەجۆرن، ڕوون نییە ئەم بڵاوکراوانە لەڕووی تیراژەوە چەند دانەیان لێ دەرچووە، هەرچەندە لەسەر بەشێك لە ڕۆژنامەکان تیراژەکەی نووسراوە.

٩- ئەو بڵاوکراوەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا لە کەلار دەرچوون، ژمارەیان (٦١) بڵاوکراوەیە، هەر بۆیە بڵاوکراوەی تر لەو مێژوودا دەرچووەو ڕەنگە بەردەستی من نەکەوتبێت، ئەو بڵاوکراوانەی دەرچوون، لەڕووی ناوەڕۆك‌و سیاستەوە هەمە جۆرن، واتە زۆر لایەنی ژیانیان گرتوەتەوە، بەشێك لەو بڵاوکراوانە لەلایەن حیزبە

کوردستانییەکان بە تایبەت یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دەرچوون، ئەمە سەرباری ئەوەی لە بڵاوکراوەی ئازادو سەربەخۆیش دەرچوون، بە تایبەت لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە پاش ساڵی (٢٠٠٣) دەنگە ئازادەکان زیاتر دەرکەوتون، هەرچەندە لە سەرەتاوە بڵاوکراوەو رۆژنامەکان گشتی بوون، بەڵام پاشتر دەبنە تایبەتمەند، واتە رۆژنامەو بڵاوکراوەی تایبەت بەژیان و گەنجان و قوتابیان و خوێندکاران، یان بڵاوکراوەی تایبەت بە ئەنفال دەرچووە، هەندێك لە بڵاوکراوەکان لە بۆنەو یادێکدا تەنها ژمارەیەك یان دوانیان لێ بڵاوکراوەتەوە.

١٠-سەرباری ئەو بڵاوکراوانەی لە بواری نووسراودا لێرەدا خراونەتە روو، بە هەمان شێوە سنووری کەلار لە بواری رۆژنامەوانی نووسراوو بینراویشدا گەشەی کردووە، لە دوای ساڵی (٢٠١١)ەوە ئەم کاروانە درێژەی هەیە، بە شێوەیەك جگە لەو رۆژنامەو بڵاوکراوانەی لێرەدا ناویان هاتووە، بڵاوکراوەی تر دەرچوون و بەردەوامن، بۆ نمونە وەك (گەران، رایەل، رۆژ، هەلمەت، روانینی نوێ، گۆڤاری زانستی زانکۆی گەرمیان..)، لەو بڵاوکراوانەی سەرەوەدا (١٩٩١- ٢٠١١) تەنها یەك دانەیان لە دەرچوون بەردەوامە، ئەویش (گەرمیانی ئەمرۆ)یەو ئەوانی تر بە هۆکاری جۆر بە جۆر وەستاون، بە تایبەت خراپی دۆخی مادی هۆکاری سەرەکی بووە.

١- میلکان

بڵاوکراوەیەکی سیاسی ئەدەبییە - لقی خانەقینی پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان بە هەر دوو زمانی کوردی و عەرەبی دەریدەکات، تەنها ژمارە سێ (٣)ی ئەم بڵاوکراوەیە پارێزراوە، لە (١ی تەموزی ١٩٩١) دەرچووە.

لەم ژمارەی میلکاندا ناوی کەسی لەسەر نییە، بەڵام بە قەبارەی بچووك بە دوانزە لاپەرەی رەش و سپی بڵاوکراوەتەوە، هەرچەندە ئەم بڵاوکراوەیە لەلایەن لقی خانەقینی ئەو پارتەوە دەرچووە، بەڵام زۆرتر لە کەلار دەرچووە و کارەکانی لە کەلاردا بووە، چونکە ئەم شارە لە راپەریندا بۆ ماوەیەکی کەم ئازاد بوو، زۆرێك لە ئیش و کارەکانی ئەم شارە لە کەلار رایدەکرا، بەتایبەت کارە حیزبییەکان (ئەم بڵاوکراوەیە بە یەکەم بڵاوکراوەی کەلارو گەرمیان دادەنرێت، کە لە پاش راپەرین لە سنوورەکە دەچووە، واتە پێش ئەو بەروارە ئێمە بڵاوکراوەی ترمان بەرچاوناکەوێت، گەر ئەم بڵاوکراوەیە مانگی جارێکیش دەرچووبێت ئەوا ژمارە یەکی لە مانگی ئایار دەرچووە).

میلکان بابەتەکانی بە هەر دوو زمانی عەرەبی و کوردی بڵاوکراوەتەوە، کە زۆر تر بابەتەکانی ژمارە سێ بە زمانی عەرەبی بووە، مانشیتی ئەم ژمارە بریتییە لە (الحكم الذاتي هو اقل مما يطالب به شعب كردستان).

٢- پەیامی ئازادی

ئۆرگانی ناوەندی لقی دیالە/ حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی عێراقە، ژمارە (٢)ی لە تشرینی یەکەمی (١٩٩١) بڵاوکراوەتەوە، ژمارە دووی کە پارێزراوە، بە هەشت لاپەرەی قەبارە بچووك بە رەش و سپی بە زمانی کوردی دەرچووە.

لە پێرستەکەیدا، چەندین بابەت بەرچاو دەکەون لەوانە: سەروتار کە لەلایەن شێروان شێروەندییەوە نووسراوە، هەروەها وێنەیەکی سەیدا ساڵح یوسفی بەدیدەکرێت کە لەژێر وێنەکەدا نووسراوە (دامەزرێنەری حیزبی سۆسیالیستی کوردستان/ عێراق، شەهیدی نەمر سەیدا ساڵح یوسفی.

پەیامی ئازادی بە هەمان شێوەی میلکان لە بڵاوکراوە یەکەمینەکانی سنووری گەرمیان دادەنرێت دادەنرێت، کە بە ناوی دیالەو خانەقینەوە بڵاوکراوەتەوە بەڵام بەهۆی گرتنەوەی خانەقین لەلایەن رژێمی بەعسەوە، کارەکانی ئەو شارە لە کەلار بووە، بۆیە ئەم بڵاوکراوەیە بە دووەمین بڵاوکراوەی پاش راپەرین لە گەرمیان و کەلار دادەنرێت.

٣- تیشك

تیشك گۆڤارێکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییە، هەموو مانگێك لەلایەن قوتابی عادل مەلا ساڵحەوە دەردەچێت، ژمارە چوار (٤)ی لە ساڵی (١٩٩٤) دەرچووە (ئەم گۆڤارە بە دەست نووسراوەتەوە لەسەر دەفتەرێکی قەبارە بچووك و بڵاوکراوەتەوە).

بەڕێوەبەری گشتی و سەرنووسەر: عادل مەلا ساڵح دەستەی نووسەران (عادل نازێی، ئەرسەلان محەمەد رۆستەم).

٤- وەرزش و گرمیان

بڵاوکراوەیەکی وەرزشییە، یانەی وەرزشی شێروانە بە (١٥) رۆژ جار دەریدەکات، ژمارە سێ (٣)ی لە (١٨ی نیسانی ساڵی ١٩٩٤) بە چوار لاپەرەی قەبارە بچووك دەرچووە.

لەم ژمارەیەدا نووسراوە، دەستەی نووسەران (حەسەن عەلی سەلیم، عەدالت عەبدوڵڵا، خەلیل، رەفعەت حەسەن) یەکەی کۆمپیوتر (کامەران جەمال، هێرۆ ئەحمەد، هەلالە عەلی)، لە مانشێتی ئەم ژمارەیەدا نووسراوە" لە وەرزی نوێیدا، باشتر وایە لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان کارو پلەی کادریرەکانی هەڵسەنگێنێت".

ژمارە (٥)ی گەرمیان و وەرزش لە ١٧ی ئابی ساڵی ١٩٩٦ بە چوار لاپەرەی قەبارە بچووك دەرچووە، لەم ژمارەیەدا سەرنووسەر: حەسەن عەلی سەلیم، بەڕێوەبەری نووسین: عەدالەت عەبدوڵڵا، سەرپەرشتیاری هونەری: (خەلیل رەفعەت)ە، لەم ژمارەیەدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی چەندین بابەت بەدیدەکرێت و بڵاوکراوەکەیش بووەتە مانگانە.

٥- کەڵیار

رۆژنامەیەکی مانگانەی رۆشنبیری زانستی گشتی خوێندکارییە، لەسەر ئەرکی کۆمەڵێك خوێندکاری پەیمانگای تەکنیکی کەلار دەردەچێت. ژمارە (٠)ی لە (٨ی نیسانی ساڵی ١٩٩٦) بە دوو لاپەرەی قەبارە بچووك بڵاوکراوەتەوە، ژمارە (١)ی کەڵیار لە (٨)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٦) بە شەش

(٦) لاپەرەی قەبارە گەورە دەرچووە.
لە مانشێتی ژمارە (١)دا نووسراوە دوو پەیمانگا بناغەی زانکۆیەکی مۆدێرنە، ئەم بلاوکراوەیە ناوی ستاف لەسەر نییە.

### ٦- گۆڤار

گۆڤار، گۆڤارێکی سیاسی رۆشنبیری گشتییە، ژمارە (١) ی لە کانونی دووەمی ساڵی (١٩٩٨) لە کەلار بە (٥٢) لاپەرەی رەش‌و سپی بە بەرگێکی تا رادەیەك رەنگاورەنگ بلاوکراوەتەوە، لەسەر بەرگەکەی وێنەیەکی قەلای شێروانەی لەسەرە، کە لەپاش راپەرین گیراوەو خەلکێکی زۆری لەسەرە، بەرگی دواوەی تابلۆیەکی ئیسماعیل خەیاتە.
لە ژمارە یەکدا (سەردار عەبدوڵڵا) سەرنووسەر بووە، دەستەی نووسەران بریتین لە (لوقمان خەیالی، مەجید سالح، تەها سلێمان، عەدالەت عەبدوڵڵا)، بە ناونیشانی (قسە قسە دێنێ) سەروتارێك نووسراوە.
لە ژمارە دووەوە (رەفعەت عەبدوڵڵا) بووەتە خاوەنی ئیمتیاز، رەحمان خانیش هاتووەتە ناو ستاف نووسینەوە، ژمارە (٢) لاپەرە دەرچووە، ژمارە سێ‌و چوار پێکەوە بە (٥٢) لاپەرە لە ئایارو حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٨) بلاوکراوەتەوە، ژمارە پێنجی بە (٥٠) لاپەرە لە کانونی دووەمی ساڵی (١٩٩٩) بە بەرگ‌و شێوازێکی باشترو جوانتر دەرچووە.

### ٧- تۆژەر.

تۆژەر وەرزانەیەکی رووناکبیری، زانستی، گشتییە، پەیمانگای تەکنیکی کەلار بە زمانی کوردی‌و عەرەبی دەریدەکات، ژمارە (١)ی لە هاوینی ساڵی (١٩٩٨) بە پەنجاو هەشت (٥٨) لاپەرەی رەش‌و سپی بە بەرگێکی رەنگاورەنگەوە دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: یونس ساڵەیی، سەرنووسەر: ئەحمەد باوەر، لە بەرگی پشتەوەی ئەم گۆڤارە وێنەی بەشێك لە دەرچووانی پەیمانگای تەکنیکی بۆ ساڵی خوێندنی ساڵی (١٩٩٧- ١٩٩٨) بلاوکراوەتەوە، ئەم گۆڤارە تەنها ئەم ژمارەی دەرچووە.

### ٨- پرشنگی نوێ.

پرشنگی نوێ گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەی گشتییە، کۆمەلێك خوێندکار لە سمود دەریدەکەن، ژمارە (٠)ی لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٨) بە بیست (٢٠) لاپەرەی رەش‌و سپی بە قەبارەی بچووك دەرچووە (ئەم گۆڤارە بە دەست نووسراوەتەوە).
سەرنووسەر: مەریوان حەسەن قادر، جێگری سەرنووسەر: مەحموود سالح قادر، بەرێوەبەری نووسین: حەسەن ئەحمەد محەمەد، دەستەی نووسەران (عومەر ئەحمەد، ئەیاد ئەحمەد رەشید، هەژار ئیبراهیم، دیاری ئەسعەد، ئیبراهیم سدیق، دیار عەلی).
ئەم گۆڤارە بە دەست نووسراوەتەوەو کۆپی کراوە تەنها ئەم ژمارەی لێ دەرچووە.

### ٩- سۆز.

سۆز بلاوکراوەیەکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە، بەرنامەی باخچەی نێزگە لە دەنگی یەکگرتوو رادیۆی کەلار دەریدەکات، ژمارە (١)ی سۆز کە لە شێوەی گۆڤارێکی گیرفانییدا بووە لە دووتوێی چل (٤٠) لاپەرەدا لە (١ی کانونی دووەمی ١٩٩٩) دەرچووە، کە هاوکات بوو بە مانگی پیرۆزی رەمەزان‌و سەری ساڵی تازەی زایینی (١٩٩٩)، ناوەرۆکەکەی بریتی بوو لە هەلبژاردەی گرنگترین بابەتی ئەو نامەو دەفتەرنامەی هاورێیانی بەرنامەی باخچەی نێزگە بۆ بەرنامە دەیاننارد.
ئەم بلاوکراوەیە ژمارە (٤)ی بە (٣٨) لاپەرەی بچووك(گیرفان) بە هەر سێ رەنگی رەش‌و سپی‌و سورێکی کال دەرچووە، (مێژووی دەرچوونی لەسەر نییە)، سۆز (٥) ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە، لەلایەن هەریەکە لە کارمەندانی رادیۆ (عادل حوسێن قادر، فەریق محەمەد سالح، والی محەمەد مەحموود) ەوە بەرێوەدەبرا.

### ١٠- پێنووس (پێنوس)

بلاوکراویەکی مانگانەیە یەکێتی گشتی قوتابیانی کوردستان- عێراق، لیژنەی ناوچەی کەلار دەریدەکات، لە ژمارە (٩)یدا نووسراوە بلاوکراوەیەکی رۆشنبیری گشتییە، لقی کەرکوکی-یەکێتی گشتی قوتابیانی کوردستان دەریدەکات، ژمارە (١)ی لە سەرەتای تەموزی (١٩٩٩) دەرچووە بە قەبارەی بچووك بە (١٢) لاپەرەی رەش‌و سپی.
ئەم بلاوکراوەیە خاوەن ئیمتیازی لەسەر نەنووسراوە، بەلام وەك دەردەکەوێت رێکخراوەکە بووە، سەرپەرشتیار:محەمەد عەزیز، دەستەی نووسەران بریتین لە (ئارام حەسەن، کاروان عەلی، ئازاد عوسمان).
ئەم بلاوکراویە چەندین گۆرانکاری بەسەر ستافەکەیدا هاتووە، لە ژمارە (٩)یشدا دەبێە نۆرگانی لقی کەرکوکی رێکخراوەکە، لە ژمارە (١٤)دا، سەرپەرشتیار: هیوا محەمەد، سەرنووسەر: ئارام ئیکرام بووە.
ئەم بلاوکراوەیە تێکرا (١٤) ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە، کە دوا ژمارەی کە ژمارە (١٤)یە بەهەلە لەسەری نووسراوە (١٣) لە ئازاری ٢٠٠١ دەرچووە، پاشکۆیەکی بلاوکردووەتەوە لە ١٥ی مایسی ساڵی٢٠٠٠.

### ١١- گەرمیان.

مانگانەیەکی رۆشنبیری گشتییە، مەلبەندی ١١ی گەرمیانی (ی.ن.ك) دەریدەکات، ژمارە (٠)ی لە ٩ی ئاداری ساڵی ٢٠٠٣ لە کەلار دەرچووە. ژمارە (٣)ی گەرمیان لە ١ی ئابی ساڵی ٢٠٠٣ بە هەشت لاپەرەی قەبارە گەورە بە رەنگی رەش‌و سپی‌و سەوز دەرچووە، لە مانشێتی ئەم ژمارەیەدا هاتووە" لە پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەی عێراقدا، پێویستە بایەخی زیاتر بە ئاوەدانکردنەوەی گەرمیانی بدرێت".
خاوەنی ئیمتیاز: مەلبەندی رێکخستنی گەرمیانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سەرنووسەر: رزگار حاجی حەمید، جێگری سەرنووسەر: سەلام عەلی، بەرێوەبەری نووسین: سەلام کەریم. ژمارە (٩)ی مانگانەی گەرمیان بەهەشت

لاپەڕەی قەبارە گەورە لە شوباتی ساڵی ٢٠٠٤ دەرچووە.

**١٢- پەیامی لاوان ( پەیامی گەنج ).**

ئەم بڵاوکراوەیە سەرەتا لەلایەن ناوچەی ڕزگاری - یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق دەرکراوە دواتر ڕاگەیاندنی لقی گەرمیانی یەکێتییەکە دەریکردووە، پەیامی لاوان ژمارە (٠)ی لە مانگی تەموزی ساڵی ٢٠٠٣ دەرچووە بە قەبارەی بچووك بە (٨) لاپەڕەی ڕەش‌و سپی، دواتر ناوەکەی بووە بە (پەیامی گەنج).

ئەم بڵاوکراوەیە لەلایەن ناوچەی ڕزگاری و لقی گەرمیانی ئەو یەکێتییەوە دەرکراوە، کە دەتوانرێ وەك خاوەنی ئیمتیاز دابنرێت، سەرپەرشتیاری بڵاوکراوەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی (بەهادین کەمال) بووە، دەستەی کاری بریتی بووە لە (سیروان سەعید، نەوزاد فوئاد، غازی شکور،..)، پاشتر (شێرکۆ ئەحمەد چوار شاخی) بووەتە جێگری سەرپەرشتیار.

ژمارە (٦)ی پەیامی لاوان لە ئابی ٢٠٠٤ بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووك دەرچووە.

پەیامی لاوان لە ژمارە (٧)ەوە ناوەکەی بووە بە (پەیامی گەنج) کە لە ١٥ی ئەیلوولی ساڵی٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك دەرچووە.

لە ژمارە (٨)ی پەیامی گەنجدا، سەرنووسەر: بەهادین کەمال، جێگری سەرنووسەر: کاوە گەرمیانی، بەڕێوەبەری نووسین: شوان جەلال بووە.

ژمارە (٨)ی پەیامی گەنج لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨ بە قەبارەی بچووك بە ڕەنگاوڕەنگی بە (٨) لاپەڕە دەرچووە.

**١٣- کەلار.**

کەلار، گۆڤارێکی وەرزییە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی شارەوانی کەلار دەریدەکات، تایبەتە بە کارە خزمەتگوازییەکانی شارەوانی‌و بابەتە هونەری‌و ئەدەبی‌و کلتوورییەکان، ژمارە (١)ی لە کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣ بە ٣٩ لاپەڕەی ڕەش‌و سپی بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە کە وێنەی قەڵای شێروانەی لەسەرە. خاوەنی ئیمتیاز: حەسەن جیهاد ئەمین، سەرنووسەر: سەرکۆ محەمەد ڕۆستەم، هاوکاران (ساڵح هەلاج، سالار مەحموود، سروە جەوهەر)، ڕاوێژکاران (ئیبراهیم باجەلان، ئەحمەد باوەڕ) بووە.

ژمارە (٣)ی گۆڤاری کەلار لە تەموزی ٢٠٠٤ بە هەمان قەبارەو بە ٢٥ لاپەڕە دەرچووەو دەستەی ڕاوێژکاران نەماوە، هاوکارانیش بوونەتە دەستەی نووسەران (دوا ژمارەی گۆڤارەکە بووە).

**١٤- بەرەوشار.**

بەرەوشار، ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی ئەهلی ئازادە، کۆمەڵە گەنجێك لە کەلار دەریدەکەن، ژمارە (٠)ی لە ١٨ی کانونی دووەمی ٢٠٠٤ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگی ڕەش‌و سپی دەرچووە.

ئەم ڕۆژنامەیە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕبووە، لەڕووی دەرچوون‌و ستاف نووسینەوە، لە ژمارە سفردا (عەدنان سەید حوسێن) سەرنووسەر، (سامان عەزیز بەڕێوەبەری نووسین) و ستاف هاوکاران، یان دەستەی نووسەران بریتی بوونە لە (محەمەد حوسێن، پشتیوان سەعید، حوسێن ئەحمەد، سەباح عەلی جاف)، ڕاوێژکاری یاسایی (ئیسماعیل نەجمەدین)، مانشێتی یەکەم ژمارە بریتییە لە "کەلار پێویستی بە خزمەتگوزاری زیاتر هەیە".

بەرەو شار، ژمارە (٤)ی لە ٢٠ی ئەیلولی ٢٠٠٤ بەهەشت لاپەڕەی ڕەش‌وسپی دەرچووە، خاوەنی ئیمتیاز: شێخ سەعید شاکەلی، سەرنووسەر: پشتیوان حەمە سەعید، بەڕێوەبەری نووسین: سامان عەزیز، دەستەی نووسەران بریتین لە (ئەرکان محەمەد ڕەشید، محەمەد حوسێن، سەباح عەلی جاف، مژدە مەحموود جاف، عەدنان سەید حوسێن).

بەرەو شار لە خولی دووەمیدا بە ستافێکی ترەوە بڵاوکراوەیەوە، ژمارە (٩)ی لە ٢٠٠٥/١٠/٣٠ بڵاوکراوەتەوە کە ستافەکەی گۆڕانی بەسەردا دێت، خاوەنی ئیمتیاز: شێخ سەعید شاکەلی، سەرنووسەر: عەدنان سەید حوسێن، بەڕێوەبەری نووسین: لاوان ئەحمەد دەستەی نووسەران: سروە جەوهەر، ئەرکام محەمەد، گەرمیان حەمە خان).

دواین ژمارەی بەرەو شار کە ژمارە (١٤)بوو ٢ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٦ بە دوانزە (١٢) لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگی ڕەش‌و سیپ بڵاوکراوەتەوە، کە (لاوان ئەحمەد) سەرنووسەر، (ساڵح میروەیس) بەڕێوەبەری نووسین، (شیلان ڕۆژبەیانی، جەلال ئەلیاسی)ی دەستەی نووسەرانن‌و لە بۆکسی ئەم ژمارەی بەرەو شاردا نووسراوە "لە ژمارەی داهاتودا"، بەرەو شار دەبێتە (گەرمیانی ئەمڕۆ).

**١٥- هەنگاو.**

هەنگاو، بڵاوکراوەیەکی زانستی ڕۆشنبیری گشتییە، پەیمانگای تەکنیکی کەلار- بەشی ڤێتێرنەری ئامادەی دەکات، ژمارە (٠- ١)ی لە ئازاری ٢٠٠٤ بە بیست (٢٠) لاپەڕەی قەبارە بچووك بە هەر سێ زمانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: بەشی ڤێتێرنەری، سەرنووسەر: د. عەلا حوسێن، دەستەی نووسەران (والی خالد، کاروان کەریم، میقداد کاکە عەبدوڵڵا، شێروان حەمە ئەمین، باوەڕ ڕەسوڵ ڕاوێژکاران (د. مەحموود حەسەن، د. سەردار محەمە).

ژمارە (٢)ی هەنگاو بە بیست پەڕە بە ڕەنگی شین‌و پەمەیی دەرچووە.

**١٦- هەشتاوهەشت.**

وەرزە گۆڤارێکی ڕووناکبیرییە، تایبەتە بە ئەنفال، ژمارە (١)ی لە بەهاری ٢٠٠٤ بە قەبارەی گەورە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ‌و بە (٢٢٤) لاپەڕە دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: مەحموود سەنگاوی، سەرنووسەر: سالار مەحموود، دەستەی نووسەران (ئەحمەد باوەڕ، تەها سلێمان، ڕزگار حاجی حەمید، سەلام عەلی)، لە ژمارە یەکیدا سەرنووسەر لەژێر ناونیشانی (١٩٨٨، وونبونی مانا.

مردنی ژیان) نوسیوە، ئەم گۆڤارە پاشکۆیەکی هەبووە، هەر بە ناوی هەشتاوهەشت لە قۆناغەکانی ئەنفالدا لە شێوەی ڕۆژنامەدا بڵاوکراوەتەوە، (هەشتاو هەشت)، بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە قۆناغەکانی ئەنفال (پاشکۆی وەرزە گۆڤاری هەشتاو هەشت)، ژمارە (١)ی لە ٢٣ی شوباتی ساڵی٢٠٠٦ بە (٨) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ لە کەلار دەرچووە، سەرنووسەر: سالار مەحموود، ژمارە چواری ڕۆژنامەی هەشتا و هەشت لە ٢٠٠٦/٥/٣ بە هەشت لاپەڕە دەرچووە.

ژمارە (١١)ی گۆڤاری هەشتاو هەشت لە بەهاری ٢٠٠٩ بە (٢٨٥)لاپەڕە دەرچووە، ستافەکەی بریتییە لە، بەڕێوەبەری بەرپرس و سەرنووسەر، سالار مەحموود، جێگری سەرنووسەر، سەلام عەلی، بەڕێوەبەری نووسین: لەتیف فاتیح فەرەج.

**١٧- ئەفراندن.**

ئەفراندن بڵاوکراوەیەکی ڕەخنەی مانگانەیە بەشی ڕۆشنبیری لقی گەرمیانی یەکگرتوی قوتابیان سەرپەرشتی دەکات، ژمارە (٠)ی لە ١ی نیسانی ساڵی٢٠٠٤ بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەنگی ڕەش‌وسپی دەرچووە.

ئەم بڵاوکراوەیە ستافەکەی بەردەوام گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە ئەم کەسانە ستافەکەی بوونە، لە ژمارە (٠-١) دا سەرنووسەر: ئاکۆ هۆرێنی، بەڕێوەبەری نووسین: بورهان محەمەد، دەستەی نووسەران (سارا مەجید، بیلال سەعید، حەمید عەلی، دیزاین: سامان مەجید).

لە ژمارە (٦)دا ستافەکە بریتییە لە، سەرنووسەر: حەمید عەلی، بەڕێوەبەری نووسین: سەردار ساڵح سیامەن سەلام لەگەڵ دەستەی نووسەران.

لە ژمارە (١١)دا ستافەکە بریتییە لە، سەرنووسەر: سیامەن سەلام، بەڕێوەبەری نووسین: جەلال جومعە، لەگەڵ دەستەی نووسەران.

دواین ژمارەی ئەفراندن کە ژمارە (١٤)یە لە تەموزی ٢٠٠٥ بەشەش لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەنگی ڕەش‌و سپی بڵاوکراوەتەوە.

**١٨- خەڵك.**

خەڵك مانگنامەیەکی گشتی ئازادەو لە گەرمیان دەردەچێت، ژمارە (١)ی لە کۆتایی نیسانی ٢٠٠٤ بە هەشت لاپەڕەی ڕەش‌و سپی بە قەبارەی گەورە دەرچووە، حەوت لاپەڕە بە زمانی کوردی‌و یەك لاپەڕە بە زمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.

خاوەنی ئیمتیاز: عەلی ئەحمەد کەریم، سەرنووسەر: تەها سلێمان، سکرتێری نووسین: هۆشیار عەبدولعەزیز، دەستەی هاوکاران (کەمەران یاروەیس، سەردار ڕەحیم، هیوا محەمەد، ساڵح عەلی، کامەران ئەدیم، سەهەند عەبدوڵڵا)، لە ژمارە (٢) کە لە کۆتایی ئایاری ٢٠٠٤ بە دوانزە لاپەڕەوە دەرچووە ئەو دەستەیە بوونەتە ستاڤ نووسەران، هەر لەم ژمارەیەدا پاشکۆیەکی عەرەبی بە ناوی (ملحق عربي) خەڵك بە یەك پەڕە بڵاوکراوەتەوە.

ژمارە (٢٠)ی خەڵك کە لە کۆتایی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥دا دەرچووە، پەڕەکانی بووەتە بیست (٢٠) لاپەڕەی قەبارە گەورە، ژمارە (٢٢)ی لە کۆتایی شوباتی ٢٠٠٦دا بە ١٢ لاپەڕە دەرچووە، ستاڤ نووسینی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، خاوەنی ئیمتیاز: عەلی ئەحمەد کەریم، سەرنووسەر: هۆشیار عەبدولعەزیز، جێگرانی سەرنووسەر (عەلی نارێنی، سەلام عەبدوڵڵا)، بەڕێوەبەری نووسین بۆ کاروباری سیاسی: هیوا محەمەد، بەڕێوەبەری نووسین بۆ کاروباری ژنان: مژدە مەحموود جاف، بەڕێوەبەری هونەری: حەسەن عەبدولخالق.

**١٩- کەنار**

مانگنامەیەکی ئەهلییە گرووپێك گەنج لە گەرمیان دەری دەکەن، یەکەم ژمارەی لە ١٥ی تەمموزی ساڵی ٢٠٠٤ بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووکی ڕەش‌و سپی دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: بێستون ژاڵەیی، بەڕێوەبەری نووسین: فەریق حەمە ساڵح، کارگێڕی‌و دارایی: والی محەمەد، دەستەی نووسەران (عادل حوسێن، سوعاد حاتەم، دلێر عەبدولڕەحمان، پەیمان عەبدولرحمان، حەمید عەلی، هەردی مەهدی، هێمن بابان)، تایپ دلێر عەبدولڕەحمان.

ژمارە (١١)ی لە ٢٤ی تەممووزی٢٠٠٥ بە (١٢) لاپەڕەی ڕەش‌و سپی دەرچووە، (کەنار ژن)، پاشکۆیەکی ژنانەی تایبەتی مانگنامەی کەنارە، یەکەم ژمارەی لە شوباتی ٢٠٠٦ بە چوار لاپەڕە دەرچووە سەرپەرشتیار: سوعاد حاتەم، ستاڤ نووسین، (پەیمان ئەمین، چنور بەرزنجی، شەیما جەمال، ڕووناك محەمەد، شنۆ قادر حەسەن).

ژمارە ٢٢ی کەنار لە ئایاری ٢٠٠٧ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگی ڕەش‌و سپی بڵاوکراوەتەوە، لەم ژمارەیەدا ستاڤ نووسین بریتین لە، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: بێستون ژاڵەیی، بەڕێوەبەری نووسین: فەریق حەمە ساڵح، کارگێڕی‌و دارایی: والی محەمەد، دەستەی نووسەران (دڵشاد ئەنوەر، هێمن بابان، حەمید عەلی)، مانگانەی کەنار لە کەلار خاوەنی یەکەمین پەیجی تایبەت بە خۆی بووە لە ئەنتەرنێت بە ناوی www. Knarorg

**٢٠- داینەمۆ.**

داینەمۆ مانگنامەیەکی گشتی سەربەخۆیە، کۆمەڵێك گەنجی ناحیەی ڕزگاری دەریدەکەن، ژمارە (٠)ی لە کۆتایی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك دەرچووە، لە مانشێتی ئەم ژمارەیەدا هاتووە " لە سنووری ناحیەی ڕزگاریدا، ٧٨ گوند بێبەشن لە خوێندنگە، بنکەی تەندروستی، ئاو کارەبا ڕێگاو بان".

سەرنووسەرو سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردن: ڕێبین تەها لێخوڕەی، دەستەی نووسەران (کوردۆ عەزیز، ئەرکان محەمەد ڕەشید)، ئەم مانگنامەیە لە ژمارە (١)ەوە کە لە کانونی دووەمی ٢٠٠٥ بە هەشت لاپەڕەی گەورە بڵاوکراوەتەوە، خاوەنی ئیمتیاز: سەباح عەلی جاف، سەرنووسەر: ڕێبین تەها لێخوڕیی، جێگری سەرنووسەر: ئەرکان حەمە ڕەشید، بەڕێوەبەری نووسین: کوردۆ عەزیز.

داینەمۆ لە ژمارە (٩)یدا، کە لە سەرەتای نیسانی ٢٠٠٦

بڵاوکراوەتەوە نووسراوە (مانگانەیەکی گشتی سەربەخۆیە کۆمەڵێك گەنجی ناحیەی ڕزگاری هەر کاتێك پەرەیان هەبوو دەریدەکەن)، ژمارە ١١ی داینەمۆ لە ئەیلولی ٢٠٠٦ بە دوانزە (١٢) لاپەرە دەرچووە کە پاشکۆی (نەعلەشۆ)یشی لەگەڵدایە، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: ڕێبین تەها، بەڕێوەبەری نووسین: دەشتی ئەنوەر لێخوڕەیی، دەستەی نووسەران (سەیوان خەلیل، کاوە ئەحمەد، سۆران حەمە سەعید).

نەعلەشۆ هەر چەندە ژمارە یەکی بە جیاوازو سەربەخۆ دەرچووە، بەڵام ژمارە دووی لەگەڵ داینەمۆدا بڵاوکراوەتەوە، نەعلەشۆ، نەعلەتنامەیەکی برێ نەعلەتی لە گەرمیان هەر کاتێك هەوەسیان بوو، نەعلەت ئەوەشێنن، ژمارە (١)ی لە یەکەمین ڕۆژانی ساڵی ٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەش‌وسپی بڵاوکراوەتەوە.

ستافەکەی بریتین لە، نەغلەتکاری عام: ڕێبین تەها، مەسولی پارەو پول: کاوەی مالیە، نەعلەتکارە فەرعییەکان (عەدنان مەلا سالح حەیدەر محەمەد، شاهۆ عەبدوڵڵا).

## ٢١- شکۆفە.

پەیڤنامەیەکی ڕۆشنبیری گشتی ناوبەناوە، نوێنەرایەتی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کوردستان دەریدەکات، ژمارە (١)ی لە کانونی یەکەمی ٢٠٠٤ بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووکی ڕەنگاوڕەنگ دەرچووە.

دەستەی ئامادەکاری شکۆفە بریتییە لە (هێڤی، زانا، هەنسك)، لە مانشێتی یەکەم ژمارەدا نووسراوە "یەکێتی قوتابیانی کوردستان، دەنگ دەکڕێت بە پارە".

ژمارە (٢)ی شکۆفە لە کانونی دووەمی ٢٠٠٥ بە چوار پەڕەی قەبارە بچووك بڵاوکراوەتەوە.

## ٢٢- زیپان.

زیپان گۆڤارێکی ڕۆشنبیری کۆکراوەیە، لقی کەلاری-بنکەی ئەدەبی ڕووناکبیری گەلاوێژ بە زمانی عەرەبی بڵاوی کردووەتەوە، ژمارە (٠)ی لە ساڵی ٢٠٠٤ بە قەبارەی بچووك بە ٣٢ لاپەڕەی ڕەش‌و سپی دەریکردووە (ئەم گۆڤارە لە ژمارە سەرەتایەکانیدا بابەتەکانی بە زمانی عەرەبی لە سایتەکانی ئەنتەرنێتەوە وەرگیراوە).

زیپان ژمارە (١٠)ی لە پایزی ٢٠١١ بەهەر دوو زمانی کوردی‌و عەرەبی بە (٤٠) لاپەرە بە بەرگێکی ڕەش‌و سپییەوە بڵاوکراوەتەوە، سەرپەرشتیار: ئەحمەدی خۆشنوس، بەڕێوەبەری جێبەجێکار: ئاسۆ وەهابە.

## ٢٣- شێروانە.

شێروانە گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی ڕووناکبیرییە، دوو مانگ جارێك شارەوانی کەلار دەریدەکات، ژمارە (٤) کە لە شوباتی ٢٠٠٥ لەسەر بەرگی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە نووسراوە، بە ٤٨ لاپەڕەی ڕەش‌و سپی بەبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە (بەو مانایەی درێژە پێدەری گۆڤاری پێشووی کەلار بوبێت).

خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری دەستەی بەڕێوەبردن: سەرۆکایەتی شارەوانی کەلار، دەستەی بەڕێوەبردن (سالار مەحموود، جەمال ئەکبەر، مەجید سالح، ئەرکان محەمەد ڕەشید، کاروان یارویس، عەبدوڵڵاحەسەن‌و گوڵاڵە عەزیز) بووە، ئەم ژمارەیەکی بە ٥٢ لاپەڕەی ڕەش‌و سپی دەرکراوە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ کە وێنەیەکی قەڵای شێروانەی لەسەرە.

گۆڤارێکی شێروانە لە ژمارە (٥)دا کاروان یارویس بووەتە سەر نووسەری‌و دەستەی بەڕێوەبردن کراوە بەدەستەی نووسەران، ژمارە (٣)ی ئەم گۆڤارە، کە دەکاتە ژمارە (٦)ی پێشوو لە پایزی ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە، لەم ژمارەدا (سەلام عەلی محەمەد) کراوەتە خاوەن ئیمتیاز. ژمارە (٤) کە دەکاتە ژمارە (٧) بەهاری ٢٠٠٦دا بە ٦٤ لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.

## ٢٤- پەیامی خوێندکار.

بڵاوکراوەیەکی خوێندکاری ئازادە، کۆمەڵێك خوێندکاری سەربەخۆ لە کەلار دەریدەکەن، ژمارە (١)ی لە ١ی نیسانی ساڵی٢٠٠٥ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەنگی ڕەش‌و سپی دەرچووە.

سەرنووسەر: گەرمیان حەمە خان، بەڕێوەبەری نووسین: کاوە ئەحمەد، دەستەی نووسەران (ئاسود کوردستانی، ماریا کەمال) تایپ: کۆماجی لالە فایەق، لە مانشێتی ئەم ژمارەدا نووسراوە "لە ئەنجامی ڕاپرسییەکدا: خوێندکارانی کەلار گەشبین بە پەرلەمانی تازە هەڵبژێردراوە".

ژمارە (٥)ی ئەم بڵاوکراوەیە لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەش‌و سپی بڵاوکراوەتەوە، خاوەنی ئیمتیاز: کاوە ئەحمەد، سەرنووسەر: گەرمیان حەمە خان، دەستەی نووسەران (محەمەد ئەمین، شاهۆ عەبدوڵڵا، عەباس ئەنوەر، ماریا کەمال، سۆما عەبدوڵڵا، ئاکۆ ئەحمەد، دەشتی ئەنوەر).

## ٢٥- کۆست.

کۆست بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە کۆستی ئەنفال، ژمارە (١)ی لە ١٤ی نیسانی ساڵی٢٠٠٥ بە دوانزە (١٢) لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەنگی ڕەش‌و سپی لەژێر مانشێتی "ماڵێکی ئەنفالانە" بڵاوکراوەتەوە.

کۆست لەلایەن لیژنەی باڵای مەراسیمی حەڤدەهەمین ساڵیادی ئەنفالەوە لە گەرمیان ئامادە کراوە، ئەم بڵاوکراوەیە لە ڕۆژی ١٤/٤دا مەراسیمی ئەنفالدا بڵاوکراوەتەوە.

## ٢٦- ئایندەی گەرمیان.

بڵاوکراوەیەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی گشتییە ڕاگەیاندنی مەڵبەندی (١١)ی ڕێکخستنی گەرمیان دەریدەکات، ژمارە (٠)ی لە ٢٥ی حوزەیرانی ساڵی٢٠٠٥ بە (٨) لاپەڕەی ڕەش‌و سپی لە کەلار دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: ڕاگەیاندنی مەڵبەندی (١١)ی ڕێکخستنی گەرمیان، سەرنووسەر مەجید سالح، جێگری سەرنووسەر:

ڕزگار حاجی حەمید، بەڕێوەبەری نووسین: ئاسۆ وەهاب.
ئایندەی گەرمیان ژمارە (١٦)ی لە ١ی حوزەیرانی ساڵی٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەو بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە، ئەم ژمارەیەی تایبەتە بە ساڵیادی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی، ستافەکەی بریتییە لە سەرنووسەر: مەجید ساڵح، بەڕێوەبەری نووسین: ئاسۆ وەهاب، دیزاین: ئاسۆ وەهاب.
ئایندەی گەرمیان ژمارە (٥٤)ی لە شوباتی ٢٠١٠ بە هەشت لاپەڕە دەرکردووە بە مانشێتی "گەرمیان هەر قەڵا سەوزەکەی جارانە "، کاروان یاروەیس سەرنووسەری بووە.
ژمارەیەك لە پاشکۆکانی ئایندەی گەرمیان.
ژنپایزی، پاشکۆیەکی تایبەتە بە ڕۆژی جیهانی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ژنان، بەڕێوەبەرایەتی ماڤی مرۆڤ لە گەرمیان بە هاوکاری ئایندەی گەرمیان دەریدەکات، ژمارە (١) دیسەمبەری ٢٠٠٨.
٤/١٤ پاشکۆیەکی تایبەتی ئایندەی گەرمیانە بە یادی ٢٢ ساڵەی ئەنفال نیسانی ٢٠١٠، سەرنووسەر: کاروان یاروەیس، سەرپەرستیاری پاشکۆ: ئاوارە جاف، سەرپەرشتیاری هونەری: ئارام کەمال دەلۆ.

٢٧- گەرمیانی وەرزشی.
ڕۆژنامەیەکی وەرزشی مانگانەیە، کۆمەڵێك وەرزشکار لە گەرمیان دەری دەکەن، ژمارە (٠)ی لە ١٥ی ئابی ساڵی٢٠٠٥ بە چوار لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگی ڕەش‌وسپی دەرچووە، مانشێتی ئەم ژمارەیە بریتییە لە "گەرمیانی وەرزشی ماڵی دووەمی وەرزشکارانە".
خاوەنی ئیمتیاز: کاوە ئەحمەد شەریف، سەرنووسەر: ئەرکان محەممەد ڕەشید، دەستەی نووسەران (فەتاح وەلی شاواز، ئەسعەد ئەحمەد، ڕەنجدەر عەلی، دەشتی ئەنوەر، هەلۆ مەحموود).
ژمارە (٢) گەرمیانی وەرزشی لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی٢٠٠٥ بە چوار لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەش‌وسپی بڵاوکراوەتەوە کە فەتاح وەلی شاواز لە دەستەی نووسەراندا نەماوە.

٢٨- خوێندنی نوێ.
مانگانەیەکی خوێندکاری ئازادە، کومەڵێك خوێندکاری سەربەخۆ مانگی جارێك دەریدەکەن، ژمارە (١)ی لە ٢٠٠٥/١٢/١ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەش‌وسپی بڵاوکراوەتەوە.
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: گەرمیان حەمە خان، بەڕێوەبەری نووسین: دەشتی ئەنوەر، ستاف نووسین (ماریا کەمال، عەباس ئەنوەر، شاخەوان عەبدوڵلا، سۆما عەبدوڵلا).
ژمارە (٤)ی لە حوزەیرانی ٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورەی ڕەش‌و سپی بڵاوکراوەتەوە.

٢٩- گۆڤاری گیرفان.
وەرزە گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی سەربەخۆیە، کۆمەڵێك ڕووناکبیر لە گەرمیان دەریدەکەن، ژمارە (سفر)ی لە مانگی (١٢)ی ٢٠٠٥ دەرچووە (هەر چەندە لەم ژمارەیەدا مێژووی دەرچوونی لەسەر نییە).
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: مەلا تەحسین گەرمیانی، بەڕێوەبەری نووسین: ئومێد بەرزان برزۆ، دەستەی نووسەران (ئیبراهیم صدیق، سامان کەریم، شیلان مەجید ڕۆژبەیانی).
ژمارەیەکی گۆڤاری گیرفان بە قەبارەی بچووك (گیرفان) بە (١١١) لاپەڕەی ڕەش‌و سپی دەرچووە.
گۆڤاری گیرفان ژمارە (٢١)ی لە ساڵی (٢٠١٣) بە قەبارەی بچووك بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بە (١٠٠) لاپەڕە دەرچووە خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: مەلا تەحسین گەرمیانی، جێگری سەرنووسەر: عومەر عەبدولکەریم، بەڕێوەبەرینووسین: د. ئومێد بەرزان برزۆ، دەستەی نووسەران (سامان کەریم، ساڵح هەلاج، بەناز عومەر، ئاسۆ وەهاب، ڕەحمان عەلی، پەخشان مەحمەد).

٣٠- نەسیم.
بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری، پەروەردەییە کۆمەڵێك قوتابی مانگانە دەری دەکەن، یەکەم ژمارەی لە ساڵی ٢٠٠٥ دەرچووە بە قەبارەی بچووك.
خاوەنی ئیمتیازی ئەم بڵاوکراوەیە: ناوەندی گەرمیانی ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان، سەرنووسەر: هاوکار خۆشناو، بەڕێوەبەری نووسین: ئەرکان دارا، ستاف کارا (سەردەشت محەمەد، بیخاڵ خالید).
دوا ژمارەی نەسیم کە ژمارە (٣٢) لە شوباتی ٢٠١٢ بڵاوکراوەتەوە بەقەبارەی بچووك بەشێوەی ڕەنگاوڕەنگی بە (١٦) لاپەڕە.

٣١- وەرزشکاران.
وەرزشکاران ڕۆژنامەیەکی وەرزشی مانگانەیە کۆمەڵێك وەرزشکار لە کەلار دەریدەکەن، ژمارە (٢)ی لە ئازاری ٢٠٠٦ بە چوار لاپەڕەی ڕەش‌و سپی قەبارە گەورە دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: ئەرکان محەمەد ڕەشید، دەستەی نووسەران (مەریوان ئەحمەد، ڕەنجدەر عەلی، گۆران محەمەد، هەلۆ مەحموود)، لەژێر لۆگۆی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە "یەکەم ڕۆژنامەی وەرزشی سەربەخۆیە لە کوردستان".

٣٢- مودەریس.
مودەریس بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە میهرەجانی (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس) لیژنەی باڵای میهرەجان دەریدەکات: ئەم بڵاوکراوە تایبەتە لە ٣١ی ئاداری ساڵی٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگی ڕەش‌وسپی بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی بڵاوکراوەتەوە بە مانشێتی "مەلا عەبدولکەریمی مودەریس چرایەك بۆ شەوی یەلدای کورد".

ستاف کار بریتین لە (مەجید سالح، ئەحمەدی خۆشنووس، جەمال ئەکبەر، سۆبیە عوسمان)، ئەم بڵاوکراوەیە لەسەر ئەرکی کۆمەڵەی ڕووناکبیریی و کۆمەڵایەتی کەرکوک چاپ کراوە.

**٣٣- ئاتیە.**

ئاتیە، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریی گشتییە، مانگانە ڕاگەیاندنی ناوەندی گەرمیانی ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان دەریدەکات، ژمارە (٢)ی لە ١ی نیسانی ساڵی٢٠٠٦ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووک بە ڕەنگی ڕەش و سپی بڵاوکراوەتەوە.

سەرنووسەر: ڕاویار یاسین، دەستەی نووسەران (ژیار تەنیا، ئامانج کەلاری، ئارام محەمەد، حوسێن محەمەد، هونەر عەزیز).

**٣٤- شێخ لەنگەر (سۆراخ).**

شێخ لەنگەر مانگانەیەکی ئەهلی سەربەخۆی گشتییە لە ئاوایی شێخ لەنگەر دەردەچێت، ژمارە (١)ی لە ٢٢ی نیسانی٢٠٠٦ بە هەشت (٨) لاپەڕەی قەبارە گەورە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە.

خاوەنی ئیمتیاز: سەلاح خورشید، سەرنووسەر: محەمەد سابیر، جێگری سەرنووسەر: نومێد شێخ لەنگەری، بەڕێوەبەری نووسین: پارێزەر خەبات ڕەشید، ئەنجوومەنی نووسین (ئارام ئیکرام، ئەحمەد عەزیز، کاوە ئەحمەد، پشتیوان ئەحمەد، عومەر محەمەد، فایەق نامیق، بەختیار سەعید، شەماڵ ئەحمەد، قانع خورشید، سیروان نامیق)، ڕاوێژکاران (چیا قادر، ئاریان سالح)، دیزاین: ئەحمەدی خۆشنووس.

شێخ لەنگەر ستافەکەی بەردەوام گۆڕانی بەسەردا هاتووە، ژمارە (١٦)ی لە حوزەیرانی ٢٠١٢ بە هەشت لاپەڕە دەرچووە، کە لەستافەکەیدا تەنها ناوی خاوەن ئیمتیاز: سەلاح خورشید، سەرنووسەر: نومێد شێخ لەنگەری نووسراوە.

مانگانەی شێخ لەنگەر لە ژمارە (١٧)ەوە ناوەکەی دەبێتە (سۆراخ) کە لە تەموزی ٢٠١٢ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بەڕەش وسپی دەرچووە، کە ستافەکەی وەك ژمارە (١٦)یە

**٣٥- گەرمیانی ئەمڕۆ.**

مانگانەیەکی ئەهلیی ئازادە لە گەرمیان دەردەچێت، ژمارە (١)ی لە ٥ی ئایاری ساڵی٢٠٠٦ بە (١٢) لاپەڕەی ڕەش وسپی لە کەلار دەرچووە. خاوەنی ئیمتیاز: شێخ سەعید شاکەلی، سەرنووسەر: لاوان ئەحمەد، بەڕێوەبەری نووسین: سالح میروەیس، دەستەی نووسەران (جەلال ئەلیاسی، شیلان ڕۆژبەیانی، عەباس ئەنوەر)، مانشێتی ژمارە (١)ی بریتییە لە "لە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی پەرلەماندا، ئەندامانی پەرلەمان کۆکن لەسەر دوورخستنەوەی موستەشارو جاشەکان".

گەرمیانی ئەمڕۆ ژمارە (٤٧)ی بە دوانزە لاپەڕە لە ئەیلولی ٢٠١٠ بڵاوکراوەتەوە، لەم ژمارەیەدا، سەرنووسەر: لاوان ئەحمەد، بەڕێوەبەری نووسین: سالح میروەیسە، ژمارە (٥٦)ی لە تەمووزی ٢٠١١ بە هەشت لاپەڕەی ڕەش و سپی دەرچووە.

گەرمیانی ئەمڕۆ چەندین پاشکۆی هەبووە لەوانە:

پاشکۆی وەرزشی، پاشکۆی گەرمیانی ئەمڕۆ، ژمارە (١)، ئامادەکردنی: یاسین محەمەد، کەلاری.

پاریا، پاشکۆی ئافرەتانەی مانگنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ، ژمارە (١) لە ئازاری ٢٠٠٧، ژمارە (٣)ی لە حوزەیرانی ٢٠٠٧ دەرچووە، سەرپەرشتیار: سارا مەجید، دەستەی نووسەران (شنۆ قادر، ئیمان جەبار).

الحوار، ملحق العربی لجریدە، ژمارە (٠) لە شوباتی ٢٠٠٨، ئامادەکردنی: لاوان ئەحمەد.

پاشکۆی وەرگێران، پاشکۆی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆیە، تایبەت بە وەرگێران، ژمارە (١) لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٩، سەرپەرشتیاران (ڕزگار فایەق سەعید، ئاسۆ وەهاب).

ڕۆژی جیهانی کتێب، پاشکۆیەکی تایبەتە بە ڕۆژی جیهانی کتێب، ژمارە (١)، نیسانی ٢٠١١. سەرپەرشتیاری پاشکۆ (لاوان ئەحمەد، سالح میروەیس)، هاوکاری کارا: کازم جەباری.

چواردەی چوار: پاشکۆیەکی گەرمیانی ئەمڕۆیە تایبەتە بە تاوانی ئەنفال، نیسانی ٢٠١٠، بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووکی ڕەش وسپی بڵاوکراوەتەوە.

تیپی شانۆی منداڵانی گەرمیانی، پاشکۆیەکی گەرمیانی ئەمڕۆیە تایبەتە بە مێژووی تیپی شانۆی منداڵانی گەرمیان، ژمارە (١)، تەموزی ٢٠١١، سەرپەرشتیارانی پاشکۆ (محەمەد سابیر کەمەر، لاوان ئەحمەد، سالح میروەیس).

توێژینەوە: پاشکۆیەکی تایبەتی گەرمیانی ئەمڕۆیە، ژمارە (٣)ی لە کانونی دووەمی ٢٠١١ بە چوار لاپەڕە دەرچووە، سەرپەرشتیاری پاشکۆ: م. عەباس مەحموود، ستافی بەڕێوەبردنی پاشکۆ (سادق ئەحمەد، کارزان فواد، حەیدەر عەلی، کارزان ئازاد، عومەر عەبدولکەریم).

تا ئێستا (٢٠١٤) بەردەوامە لە دەرچوون، چەندین ژمارەی بە ڕەنگاو ڕەنگی دەرچووە، شێخ سەعید شاکەلی لە خاوەن ئیمتیازی ئەماوە.

**٣٦- چرای باوەنوور (چرا).**

چرای باوەنوور بڵاوکراوەیەکی مانگانەی ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی سەربەخۆیە، کۆمەڵێك گەنج لە باوەنور دەریدەکەن، ژمارە (٠)ی لە ئەیلولی ٢٠٠٦ بەچوار لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەش و سپی بڵاوکراوەتەوە.

خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری نووسین: عەتا محەمەد (باوە)، سەرنووسەر: هیوا ئەحمەد، جێگری سەرنووسەر: شۆڕش مەحموود، سەرپەرشتیاری چاپ: عەبدوڵڵا ڕەشید، دەستەی نووسین (سیامەند حوسێن، هێوا ئەحمەد، عەتا محەمەد، کەریم فەرەج، شۆڕش مەحموود)، هاوکاران (لێزان عەلی، باوان حەمە سالح)، لەو ناوانەدا لە دەستەی نووسیندا خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری نووسین لەگەڵ سەرنووسەردا

هاتووە، کە ئەمە جێگەی تێبینییە، لە مانشێتی ئەم ژمارەیەدا هاتووە"سەرۆکی شاروانی پێباز: بە هۆی یەکگرتەوەی هەر دوو ئیدارە پرۆسەی دابەش کردنی زەوی دواخراوە..!".
چرای باوەنور لە ژمارە (٢)ەوە ناوەکەی بووە بە (چرا)و لە ئازاری ٢٠٠٧ بڵاوکراوەتەوەو ستافەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەهەشت لاپەڕەیش بڵاوکراوەتەوە، (مامۆستا حەمە سالح هارونیش)یش بووەتە خاوەنی ئیمتیازی، بەردەوام ستاف نووسین گۆڕانی بەسەردا هاتووە.
ژمارە (١٥)ی چرا لە ئازاری ٢٠٠٩ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە، بەبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە، بڵاوکراوەکە لەسەری نووسراوە (بڵاوکراوەیەکی مانگانەی گشتی سەربەخۆیە لە باوەنوور دەردەچێت).

**٣٧- کوردەمیر.**

کوردەمیر گۆڤارێکی زانستی ساڵانەیە تایبەتە بە شوێنەوارو کەلەپوری کوردستان، بەڕێوەبەرێتی شوێنواری گەرمیان لە حوکمەتی هەرێمی کوردستان دەرینەکات.
ژمارە (١)ی لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦ بە قەبارەی گەورە بەبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە کە وێنەی (کێوی کەرەفتو)ی لەسەرە، بە (١٦٦) لاپەڕەی ڕەش‌وسپی دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: محەمەد شاکەلی، سەرنووسەر: کەمال نوری مەعروف، بەڕێوەبەری نووسین: حەسەن عەلی سەلیم، دەستەی نووسەران (محەمەد مەردان، شوکر محەمەد حەیدەر)، ڕاوێژکاران (جەمال عەبدوڵڵا قەرەداخی، سەعید شاکەلی).
ئەم گۆڤارە کە تایبەتە بە شوێنەوارو کەلەپوری کورد تەنها ئەم ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

**٣٨- بارین.**

بارین، یەکەمین ڕۆژنامەی ژنانەی ئەهلی لە گەرمیان (ئەم ڕۆژنامەیە پێشتر وەك پاشکۆ بەناوی کەناری ژن لەگەڵ ڕۆژنامەی کەنار دەردەچوو)، ژمارە (١)ی لە ٨ مارسی ٢٠٠٧ بە چوار لاپەڕەی ڕەش‌وسپی بە قەبارەی گەورە دەرچووە.
ڕۆژنامەی بارین (سوعاد حاتەم) سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردن بووەو ناوی کەسی تر لەسەر ئەم ژمارەیە بەدی ناکرێت، ژمارە (٢)ی لە نیسانی ٢٠٠٧ چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە کە بەشێکی زۆری بابەتەکانی تایبەت بە (مەرگەساتی ئەنفال)، ئەم ژمارەی بارین بە هەشت لاپەڕەی گەورەی ڕەش‌وسپی بڵاوکراوەتەوە، ستاف نووسین پێك هاتووە لە (شەیما جەمال، ساجیدە قادر).

**٣٩- رازی گەنج**

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری گشتی سەربەخۆیە، ژمارە (١) ی لە ئەیلولی ٢٠٠٧ لە کەلار بە قەبارەی بچووك بە (٤٠) لاپەڕەی ڕەش‌وسپیەوە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: فەتاح تەنیا، دەستەی هاوکاران (ڕەمەزان ئەمین، دلێر عومەر، ڕێباز کەلاری).
رازی گەنج لە ١٤ی نیسانی ساڵی٢٠٠٨ پاشکۆیەکی دەرکردووە بە ناوی (ئەنفال) کە لە (٢٨) لاپەرە پێك هاتووە لەگەڵ بەرگەکەیدا بە ڕەنگاوڕەنگی، سەرپەرشتیاران (فاتح تەنیا، سۆزان حەمە سەعید).

**٤٠- ڕوانگە**

بڵاوکراوەیەکی زانستی ڕۆشنبیری مانگانەیە، کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆ لە کەلار دەریدەکات، ژمارە (٠)ی لە شوباتی ٢٠٠٨ بە دوانزە (١٢) لاپەرە لەگەڵ بەرگەکەیدا بە قەبارەی بچووك بە ڕەش‌وسپی بڵاوکراوەتەوە.
سەرنووسەر: مەریوان حەسەن، دیزاین‌و هونەری: عەلی ڕەسول قادر، لە ژمارە دوو (٢)دا کە لە ئایاری ٢٠٠٨ دەرچووە ستاف نووسین بریتین لە (هەردی غازی، هاوکار حەسەن، عومەر محەمەد ئەمین، هەژار زەبیحی).
بڵاوکراوەی ڕوانگە ناوی خاوەنی ئیمتیازی لەسەر نییەو تەنها سێ ژمارەی لێ دەرچووە کە دواین ژمارەی ژمارە (٢)یەو بە شانزە (١٦) لاپەڕەی قەبارە بچووك چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە.

**٤١- کەلاری.**

کەلاری بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە چلەی ماتەمینی کادرو پێشمەرگەی دێرینی کوردایەتی‌و ڕووناکبیر هەڤاڵ (ئەحمەد کەلاری)، ئەم بڵاوکراوە تایبەتە لە ١٩ی نیسانی ساڵی٢٠٠٨ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە.
ئەم بڵاوکراوەیە تایبەتە لەلایەن ڕاگەیاندنی مەڵبەندی ١١ ی ڕێکخستنی کەلاری (ی.ن.ك)ەوە لە چلەی ماتەمینی کادرو پێشمەرگەی دێرینی کوردایەتی‌و ڕووناکبیر هەڤاڵ (ئەحمەد کەلاری) ئامادەی کردووە، بە سەرپەرشتی (مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا، کاروان یارەویس، ئەحمەدی خوشنووس، ئومێد ئەکرەم، جەمیل محەمەد ئیبراهیم).

**٤٢- هاوبەش.**

بڵاوکراوەیەکی ناوەندی کاری هاوبەشی ڕێکخراوەکانی گەرمیانە، ساڵانە لە یادی دامەزراندنیدا دەریدەکات، ژمارە یەکی لە ٢٢ی نیسانی ساڵی٢٠٠٨ دەرچووە.
ئەم بڵاوکراوە ناوی ستاف لەسەر نییە تەنها ناوی دیزاینەر نەبێت کە (سەرداری مەلا سالح)ە، بڵاوکراوەکە بە قەبارەی بچووك بە (١٢) لاپەڕەی ڕەش‌وسپی‌و بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە.

**٤٣- چاو.**

چاو گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیری گشتی ئازادە، ژمارە (١) ی لە نیسانی ٢٠٠٨ بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بە (٦٤) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ‌و ڕەش‌وسپیەوە بە قەبارەی گەورە دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: عومەر شەریف، سەرنووسەر: ئارام ئیکرام، بەڕێوەبەری نووسین: هێمن بابان ڕەحیم، لەم ژمارەیەدا خاوەنی ئیمتیاز ووتارێکی نوسیوە لەژێر ناونیشانی (بۆچی

چاو...؟).
ژمارە (٣١)ی گۆڤاری چاو لە شوباتی ٢٠١١ بە (٤٨) لاپەڕەوە دەرچووە، لەم ژمارەیەدا ناوی بەڕێوەبەری نووسینی لەسەر نییە، ڕاوێژکاری یاسایی زیادی کردووە بەناوی (سەرکەوت نەجمەدین).

**٤٤- ڕاساڵ**

ڕاساڵ بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری ئیسلامی سەربەخۆی مانگانەیە کۆمەڵەی فیردەوس دەریدەکات، ژمارە (٢)ی لە ١ی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٨ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەش‌وسپی دەرچووە.
ڕاساڵ ناوی ستاف لەسەر نییە، جگە لە دوو ژمارە مۆبایل‌و ئیمێڵێك کە لەسەری نووسراوە، لەلایەن کۆمەڵەی فیردەوسەوە دەرکراوە.

**٤٥- بانەڕۆژ**

بانە ڕۆژ گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتییە کۆمەڵەی ڕووناکبیری‌و کۆمەڵایەتی کەرکوك - نووسینگەکانی کفری‌و کەلار بە هاوبەشی دەریدەکەن، ژمارە (٤٢)ی لە کۆتایی کانونی یەکەمی ٢٠٠٨ بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی، بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ‌و بە (٩٨) لاپەڕەی ڕەش‌و سپی دەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: سەلاحەدین عەبدولحەمید، سەرنووسەر: لەتیف هەلمەت، بەڕێوەبەری نووسین: ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم، جێگری بەڕێوەبەری نووسین: سالح هەلاج، دەستەی نووسەران (د.عەبدولکەریم حاجی محەمەد عەلی، عەلی حوسێن سالح، ئەحمەد باوەڕ، نیشتیمان بێ ئەوا)، ڕاوێژکاران (شێخ سەعید شاکەلی، عەبدولمەجید زەنگەنە، ئیبراهیم کویخا، چیمەن سەعید جەعفەر، سەلاح گەرمیانی).
ئەم گۆڤارە بەردەوام ستافەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەتایبەت لە ژمارە (٥١)ەوە کە لە ئەیلولی ٢٠٠٩ دەرچووە، بەم شێوەیە:-
خاوەنی ئیمتیاز: سەلاحەدین عەبدولحەمید، سەرنووسەر: لەتیف هەلمەت، ئەنجوومەنی باڵای گۆڤار (شێخ سەعید شاکەلی، سالح هەلاج، شکور حەمەی هەیەر)، دەستەی نووسەران (ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم، زەینەب ئەرکەوازی، دکتۆر عەبدولکەریم حاجی، عەلی حوسێن سالح، سەیفەدین سایر).
ژمارە (٥٧)ی بانە ڕۆژ لە تەموزی ٢٠١٠ بە شەست (٦٠) لاپەڕە دەرچووە، ستافەکەی جارێکی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، ئەم گۆڤارە ژمارەیەکی لەلایەن کۆمەڵەی ڕووناکبیری‌و کۆمەڵایەتی کەرکوك لە شاری کەرکوك دەرچووە.

**٤٦- تەما**

تەما بڵاوکراوەیەکی گشتی سەربەخۆیە، دەستەیەك فێرخوازی زانکۆ هەموو (٧) مانگێك دەریدەکەن، ژمارە (١)ی لە ٧ی شوباتی ساڵی٢٠٠٩ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك بە ڕەش‌وسپی بڵاویان کردووەتەوە، وەك دەردەکەوێت ئەم بڵاوکراوەیە لە کۆلێژی پەروەردەو پەروەردەی بنەڕەتی کەلارو ئادابی خانەقین بڵاوکراوەتەوە.
ستاف ئادەبی خانەقین: دڵشاد جەلال کارێزی، کۆلێژی پەروەردەی کەلار: ڕێبەر عەباس، بڵاوکراوەی تەما لە ژمارە (٥)یدا کە لە ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی٢٠٠٩ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووك بڵاوکراوەتەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: دلاوەر نوری، جێگری سەرنووسەر: دڵشاد جەلال کارێزی، بەڕێوەبەری نووسین: محەمەد حەسەن، دیزاین: زیاد کەریم، هاوکاران (ڕێبەر عەباس، سەلاح هەولێری).
لە نووسینی ژمارە (٧،٨)ی ئەم بڵاوکراوەیەدا هەڵەرووی‌داوە ولە هەردوو ژمارەکەدا نووسراوە ژمارە (٥)، دواین ژمارەی تەما، ژمارە (٨) وەك ووتمان نووسراوە ژمارە (٥) لە ٥ی شوباتی ساڵی٢٠١٠ بە هەشت لاپەڕەی ڕەش‌وسپی لە قەبارەی ژمارەکانی پێشتر کەمێك گەورە تر دەرچووە، لەگەڵ ئەم ژمارەدا لە ساڵیادی دەرکردنی تەمادا پاشکۆیەکی چوار لاپەڕەی بە ناوی (پاشکۆی تەما) بڵاوکراوەتەوە.

**٤٧- ئاسنامە**

ئاسنامە گۆڤارێکی دەربازبووانی ئەنفالە، ڕێکخراوی چواردەی چوار دەریدەکات، دەکرێت لە ئایندەدا بەردەوام بێت، ژمارە (١)ی لە ١٤ی نیسانی ساڵی٢٠٠٩ بە بیست (٢٠) لاپەڕەو بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە.
سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردن‌و سەرنووسەر: فەتاح تەنیا، ئەم گۆڤارە ڕێکخراوی چواردەی چوار لە ڕزگاری ساڵانە دەری کردووە.
ژمارە (٣)ی ئاسنامە لە ١٤ی نیسانی٢٠٠٩ بە بیست‌و هەشت (٢٨) لاپەڕەو بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە.

**٤٨- تراژیدیا**

بڵاوکراوەیەکی تایبەت بە ساڵیادی (ئەنفال)، لە ١٤ی نیسانی٢٠٠٩دا بە (٨) لاپەڕەی ڕەش‌وسپی دەرچووە، بە مانشێتی "ئەگەر کورد جاشی نەبوایە، ئەنفال بەو شێوەیە نەدەبوو".
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: سەیوان عومەر، دیزاین: لاوان ئەحمەد.

**٤٩- کۆنفرانس گەرمیان**

کۆنفرانس گەرمیان ڕۆژنامەی تایبەتی کۆنفرانسە، لیژنەی ڕاگەیاندنی کۆنفرانس "بەرەو بەهێز کردنی پێگەی ژن لە ناوەندەکانی بریاردا "دەریدەکات، ژمارە (١)ی لە ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٩ بە چوار لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگاو ڕەنگی دەرچووە.
ستاف کار بریتین لە (ئاری عوسمان خەیات، هەڤاڵ ئیبراهیم، جیهان محەمەد، کەنعان سەعدوڵلا، ئەرکان محەمەد ڕەشید)، ئەم بڵاوکراوەیە لە ڕۆژانی کۆنفرانسی بەرەو بەهێز کردنی پێگەی ژن لە ناوەندەکانی بریاردا دەرچووە، کە بەشی کاروباری کچان‌و ژنانی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان ئەنجامی

دابوو لە کەلار.

**٥٠- گەرمیان پۆست.**

بڵاوکراوەیەکی سیاسی، فکری، کۆمەڵایەتی گشتییە لە گەرمیان دەردەچێت، ژمارەی (ئەزموونی) لە حوزەیرانی ۲۰۰۹ لە کەلار بە (۸) لاپەڕەی ڕەش و سپی دەرچووە، مانشێتی ژمارەیەکی بریتییە لە "جارێکی تر چارەنوسی ئیدارەی گەرمیان کەوتە نادیارییەوە".

خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: سەیوان عومەر، جێگری سەرنووسەر: حوسێن عەزیز، بەڕێوەبەری نووسین: کاوە گەرمیانی، ستاف کارا (هەردی مەحموود، ڕۆژان مستەفا).

ژمارە (٤٠)ی لە ئابی ۲۰۱۱ بە دوانزە (۱۲) لاپەڕەی قەبارە گەورە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ و پەڕەکانی ناوەوە بە ڕەش و سپی دەرچووە و خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری (سەیوان عومەر)ە.

ژمارە (٩٢)ی گەرمیان پۆست کە تایبەتە بە ساڵیادی ئەنفال لە نیسانی ۲۰۱۳ بە (۲۸) لاپەڕەی قەبارە گەورە دەرچووە، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: سەیوان عومەر، دەستەی نووسەران و هاوکارانی ئەم ژمارەیە بریتین لە (بریار محەمەد، خێلان عەلی، کۆسار عومەر، چیا شێخ لەنگەری، هەوراز ئەحمەد، شنۆ محەمەد، ئومێد شێخ لەنگەری).

**٥١- سروشت.**

بڵاوکراوەیەکی زانستی گشتییە، (ئامادەیی برایەتی) دەریدەکات، ئەم بڵاوکراوەیە لە ناحیەی ڕزگاری سەر بە قەزای کەلارەوە دەرچووە، ژمارە (۱)ی لە ۱ی تشرینی دووەمی ۲۰۰۹ بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووک بە ڕەش و سپی بڵاوکراوەتەوە. لەم ژمارەیەدا ناوی ستاف نووسینی لەسەر نییە و زۆربەی ژمارەکانی بە هەمان پەڕە و قەبارە بڵاوکراوەتەوە.

بڵاوکراوەی سروشت، ژمارە (۱۱)ی لە ١٤ی نیسانی ساڵی ۲۰۱۰ لە یادی (مەرگەساتی ئەنفال)دا بە دوانزە (۱۲) لاپەڕەی قەبارە گەورە بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە بڵاوکراوەتەوە، لە ڕووپەڕەی ئەم ژمارەیەدا نووسراوە (سروشت، ئامادەیی برایەتی بە چاودێری و هاوکاری بەڕێوەبەرێتی گشتی پەروەردەی گەرمیان دەریدەکات)، خاوەنی ئیمتیاز: ئامادەیی برایەتی، سەرنووسەر: سەعدوڵڵا محەمەد، بەڕێوەبەری نووسین: سۆران عەلی، دەستەی نووسەران (هاوار حەمید، شاخەوان ساڵح)، تایپ: زیاد فایەق.

**٥٢- هەفتانەی بەمۆ.**

بڵاوکراوەیەکی پەروەردەیی زانستی گشتییە لەلایەن خوێندکاران و مامۆستایانی ئامادەیی بەمۆوە دەردەچێت، ئەم بڵاوکراوەیە لە ناحیەی ڕزگاری سەر بە قەزای کەلار دەرچووە، ژمارە (۱)ی کانونی یەکەمی ۲۰۰۹ بە دوو پەڕەی قەبارە بچووک بە ڕەنگی ڕەش و سپی بڵاوکراوەتەوە.

ژمارە (٦)ی هەفتانەی بەمۆ لە ۲۰۱۰/۲/۱۷ بە هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووک بە ڕەش و سپی بڵاوکراوەتەوە، ئەم بڵاوکراوەیە جگە لە ئیمێڵ و ژمارە تەلەفۆنێک ناوی ستاف لەسەر نییە.

**٥٣- هەتاو.**

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵێک قوتابی و خوێندکاری زانکۆ دەریدەکەن، ژمارە (۱)ی لە کانونی دووەمی ۲۰۱۰ دەرچووە، ژمارە یەک بە قەبارەی بچووک بە (١٦) لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە بە ڕەنگاوڕەنگی بە تایبەت ڕەنگی نیلی.

دەستەی سەرپەرشتیاران بریتین لە (هۆشمەند ئەحمەد، دەشتی ئەحمەد، کازم جەباری، فارس ئەحمەد)، هۆشمەند ئەحمەد لە ژمارە یەکدا وتاری ژمارەی بە ناونیشانی (هەتاو ...بۆ؟) نوسیوە.

**٥٤- ڕووناکی.**

ڕووناکی مانگانەیەکی تایبەتە کۆمپانیای ڕووناکی دەریدەکات، ژمارە (۱)ی لە کانونی دووەمی ۲۰۱۰ بە چوار لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگای قەبارە گەورە دەرچووە.

ئەم بڵاوکراوەیە تایبەتە بە کارو پرۆژەکانی کۆمپانیای ڕووناکی، سەرپەرشتیاری ڕۆژنامەوانی و دیزاین: سەیوان ئەمین.

ژمارە دووی ڕووناکی لە شوباتی ۲۰۱۰ بە چوار لاپەڕەی قەبارە گەورە بە ڕەنگاوڕەنگی بڵاوکراوەتەوە.

**٥٥- داری خلە.**

داری خلە مانگانەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی شەهیدانی (داری خلە)، ئەم ژمارە تایبەتە لە شوباتی ۲۰۱۰ بە چوار لاپەڕەی بەرگ بە ڕەنگاوڕەنگی و ناوەوە بە ڕەش و سپی بە قەبارەی گەورە دەرچووە، ئەم بڵاوکراوەیە ناوی کەسی وەک ستاف لەسەر نییە.

**٥٦- داکۆکی.**

داکۆکی گۆڤارێکی ساڵانەیە هەموو ٤/١٤ کۆمەڵەی داکۆکیکار لە ماف قوربانیان و کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لە گەرمیان دەریدەکات، ژمارە (۱)ی لە ١٤ی نیسانی ساڵی ۲۰۱۰ بە سی و شەش (٣٦) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ و ڕەش و سپی و بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: کۆمەڵەی داکۆکیکار لە ماف قوربانیان و کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لە گەرمیان، سەرنووسەر: هاوڕێ پێشرەو، جێگری سەرنووسەر: شوان محەمەد ڕۆستەم.

**٥٧- مەودا.**

مەودا بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری گشتی سەربەخۆیە، کۆمەڵێک خوێندکارو قوتابی زانکۆ دەریدەکەن، ژمارە (٤)ی لە ئایاری ۲۰۱۰ بە سی و دوو (۳۲) لاپەڕەی قەبارە بچووک بە ڕەنگی ڕەش و سپی بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگەوە دەرچووە. دەستەی سەرپەرشتیاران بریتین لە (دەشتی ئەحمەد، کازم جەباری، فارس ئەحمەد).

**٥٨- زانست.**

زانست بڵاوکراوەیەکی زانستی و ڕۆشنبیری ئاینی بێ لایەنە، دەستەیەك لە دەرچووان و فێرخوازانی زانکۆ و پەیمانگاکان دەریدەکەن، ژمارە (٠)ی لە تشرینی دووەمی ٢٠١٠ بە شانزە پەڕەی قەبارە بچووك دەرچووە.

سەرنووسەر: عەدنان بارام، دەستەی نووسەران (عەلی محەمەد، هاوار عەبدوڵڵا، ڕزگار محەمەد، فەلاح حەسەن).

ژمارە (٣١)ی زانست لە ١ی ئاداری ساڵی٢٠١٤ بە (٢٤) پەڕەی قەبارە بچووك و بە ڕەنگی ڕەش و سپی دەرچووە، ستافەکەی بریتییە لە، سەرنووسەر: عەدنان بارام، دەستەی نووسەران (جیهاد قادر، بلال جەلال، هێمن عەبدولکەریم، پشتیوان حەسەن).

**٥٩- هاتوچۆ.**

بڵاوکراوەیەکی مانگانەیە، بەشی ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی گەرمیان لەگەڵ کۆمەڵێك گەنج دەریدەکات، ژمارە (١)ی لە سەرەتای کانونی دووەمی ٢٠١١ دەرچووە.

سەرنووسەر: ئومێد عەلی، بەڕێوەبەری نووسین: هونەر عەلی، دەستەی هاوکاری (کیفاح ئەحمەد، سەردار مەلا سالح).

ژمارەیەکی هاتوچۆ بە قەبارەی بچووك بە (١٢) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ دەرچووە، ژمارە (٢)ی بە (١٢) پەڕەی ڕەنگاوڕەنگی قەبارە بچووك لە مانگی دواتردا دەرچووە بەڵام لەسەری نووسراوە (هاتوچۆ، بڵاوکراوەیەکی هۆشیاری هاتوچۆیە، کۆمەڵێك لاوی سەربەخۆ لە گەرمیان دەریدەکەن).

**٦٠- لاو.**

ڕۆژنامەیەکی خوێنکاری سەربەخۆیە، بە هاوکاری کۆمیتەی ڕێکخستنی یەکێتی کەلار دەردەچێت، ژمارە (٠)ی لە شوباتی ٢٠١١ بە قەبارەی بچووك بە شەش (٦) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ بڵاوکراوەتەوە.

خاوەنی ئیمتیاز: دلێر کەمال مەحموود، سەرنووسەر: سوارە بورهان عەبدولکەریم، بەڕێوەبەری نووسین: زمناکۆکەریم محەمەد، بەڕێوەبەری کارگێڕی: داود ئەحمەد محەمەد هاوکاران (زانا حەسەن، کارزان نەعمان، زانا مەحموود)، مانشێتی ژمارە یەکی بریتییە لە "کردنی پەیمانگای تەکنیکی بە کۆلێژ بڕیارێکی زۆر گرنگ بوو بۆ گەرمیان"، لەدوا لاپەڕەی هەمان ژمارەدا، جگە لە ووتارێك، کاریکاتێرێك و ڕیکلام بەدی دەکرێت.

لاو لە ژمارە دووە لەسەری نووسراوە (ڕۆژنامەیەکی خوێندکارییە، کۆمەڵێك لاوی سەربەخۆ لە شاری کەلار دەریدەکەن)، ژمارە سێ (٣)ی ئەم ڕۆژنامەیە لە ئایاری ٢٠١١ بە هەشت لاپەڕەی ڕەنگاو ڕەنگ وەك دواین ژمارەی (لاو) بڵاوکراوەتەوە وەك ستاف ڕۆژنامەکە وەك "دوا ووتە ئاماژەیان بۆ کردووە.

**٦١- نانۆ ڕیکلام.**

گۆڤارێکی وەرزییە تەکنەلۆژیای نانۆ دەریدەکات، تاکە گۆڤاری تایبەتە بە ڕیکلام لە گەرمیان، ژمارە (٠)ی لە زستانی ٢٠١١ بە ڕەنگاوڕەنگی بە (٢٠) لاپەڕە دەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: نەبەز خالد، سەرنووسەر سەیوان ئەمین، بەڕێوەبەری کارگێڕی: هێمن ئەحمەد، سەیوان ئەمین لە ژمارە یەکی نانۆ ڕیکلامدا ووتارێکی نوسیووە بە ناونیشانی (نانۆ ڕیکلام بۆچی؟).

**لیستی بڵاوکراوەکانی شاری کەلار لەنێوان ساڵانی ١٩٩١- ٢٠١١دا**

| ژ | ناوی بڵاوکراوە | ژمارە | کاتی دەرچوون | | | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ڕۆژ | مانگ | ساڵ | |
| ١ | میلکان | ٣ | ١ | ٧ | ١٩٩١ | |
| ٢ | پەیامی ئازادی | ٢ | | ١٠ | ١٩٩١ | |
| ٣ | تیشك | ٤ | | | ١٩٩٤ | |
| ٤ | وەرزش گەرمیان | ٣ | ١٨ | ٤ | ١٩٩٦ | |
| ٥ | کەڵیار | ٠ | ٨ | ٤ | ١٩٩٦ | |
| ٦ | گۆڤار | ١ | | ١ | ١٩٩٨ | |
| ٧ | تۆژەر | ١ | | هاوین | ١٩٩٨ | |
| ٨ | پرشنگی نوێ | ٠ | | ١٢ | ١٩٩٨ | |
| ٩ | سۆز | ١ | ١ | ١ | ١٩٩٩ | |
| ١٠ | پێنووس (پێنوس) | ١ | | ٧ | ١٩٩٩ | |
| ١١ | گەرمیان | ٠ | ٩ | ٣ | ٢٠٠٣ | |
| ١٢ | پەیامی لاوان (پەیامی گەنج | ٠ | | ٧ | ٢٠٠٣ | |
| ١٣ | کەلار | ١ | | ١٢ | ٢٠٠٣ | |
| ١٤ | بەرەو شار | ٠ | ١٨ | ١ | ٢٠٠٤ | |
| ١٥ | هەنگاو | ٠-١ | | ٣ | ٢٠٠٤ | |
| ١٦ | هەشتاوهەشت | ١ | | بەهار | ٢٠٠٤ | |
| ١٧ | ئەفراندن | ٠ | ١ | ٤ | ٢٠٠٤ | |
| ١٨ | خەڵك | ١ | | ٤ | ٢٠٠٤ | |
| ١٩ | کەنار | ١ | ١٥ | ٧ | ٢٠٠٤ | |
| ٢٠ | داینەمۆ | ٠ | | ١١ | ٢٠٠٤ | |
| ٢١ | شکۆفە | ١ | | ١٢ | ٢٠٠٤ | |
| ٢٢ | زیپان | ٠ | | | ٢٠٠٤ | |
| ٢٣ | شێروانە | ٤ | | ٢ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٤ | پەیامی خوێندکار | ١ | ١ | ٤ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٥ | کۆست | ١ | ١٤ | ٤ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٦ | ئایندەی گەرمیان | ٠ | ٢٥ | ٦ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٧ | گەرمیانی وەرزشی | ٠ | ١٠ | ٨ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٨ | خوێندنی نوێ | ١ | ١ | ١٢ | ٢٠٠٥ | |
| ٢٩ | گۆڤاری گیرفان | ٠ | | ١٢ | ٢٠٠٥ | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٠ | نەسیم | ١ | | | ٢٠٠٥ | |
| ٣١ | وەرزشکاران | ٢ | | ٣ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٢ | مودەریس | ١ | ٣١ | ٣ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٣ | ئاتیە | ٢ | ١ | ٤ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٤ | شێخ لەنگەر (سۆراخ) | ١ | ٢٢ | ٤ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٥ | گەرمیانی ئەمڕۆ | ١ | ٥ | ٥ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٦ | چرا باوەنوور چرا | ٠ | | ٩ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٧ | کوردەمیر | ١ | | ١٠ | ٢٠٠٦ | |
| ٣٨ | بارین | ١ | ٨ | ٣ | ٢٠٠٧ | |
| ٣٩ | رازی گەنج | ١ | | ٩ | ٢٠٠٧ | |
| ٤٠ | ڕوانگە | ٠ | | ٢ | ٢٠٠٨ | |
| ٤١ | کەلاری | ١ | ١٩ | ٤ | ٢٠٠٨ | |
| ٤٢ | هاوبەش | ١ | ٢٢ | ٤ | ٢٠٠٨ | |
| ٤٣ | چاو | ١ | | ٤ | ٢٠٠٨ | |
| ٤٤ | راساڵ | ٢ | ١ | ٧ | ٢٠٠٨ | |
| ٤٥ | بانەڕۆژ | ٤٢ | | ١٢ | ٢٠٠٨ | |
| ٤٦ | تەما | ١ | ٧ | ٢ | ٢٠٠٩ | |
| ٤٧ | ناسنامە | ١ | ١٤ | ٤ | ٢٠٠٩ | |
| ٤٨ | تراژیدیا | ١ | ١٤ | ٤ | ٢٠٠٩ | |
| ٤٩ | کۆنفرانس گەرمیان | ١ | ٢٢ | ٤ | ٢٠٠٩ | |
| ٥٠ | گەرمیان پۆست | ١ | | ٦ | ٢٠٠٩ | |
| ٥١ | سروشت | ١ | | ١١ | ٢٠٠٩ | |
| ٥٢ | هەفتانەی بەمۆ | ١ | | ١٢ | ٢٠٠٩ | |
| ٥٣ | هەتاو | ١ | | ١ | ٢٠١٠ | |
| ٥٤ | ڕووناکی | ١ | | ١ | ٢٠١٠ | |
| ٥٥ | داری خلە | ١ | | ٢ | ٢٠١٠ | |
| ٥٦ | داکۆکی | ١ | ١٤ | ٤ | ٢٠١٠ | |
| ٥٧ | مەودا | ٤ | | ٥ | ٢٠١٠ | |
| ٥٨ | زانست | ٠ | | ١١ | ٢٠١٠ | |
| ٥٩ | هاتوچۆ | ١ | | ١ | ٢٠١١ | |
| ٦٠ | لاو | ٠ | | ٢ | ٢٠١١ | |
| ٦١ | نانۆ ڕیکلام | ٠ | | زستان | ٢٠١١ | |

*** مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی لە خورماتوو**

**سەلاح شوکر**

شاری خورماتوو یەکێکە لە شارە گرنگەکانی باشووری کوردستانو بەدەروازەی کوردستان دادەنرێتو پێگەیەکی ستراتیژی جوگرافی مەزنی هەبووە لە مێژووی ناوچەکەدا لەبەر ئەوەی هاوسنوورە لەگەڵ بەشە عەرەبییەکەی عێراقدا هەمیشە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق هەوڵی تەعریب کردنو سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتییان داوەو بەردەوامی هیچ بوارێکی ئازادی بە هەموو لایەنەکانی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆژنامەگەری... هتد، نەئەداوەو هەموو بانگەوازێکی ئازادی بێدەنگ دەکرد، وێڕای بوونی کەسانی ڕۆشنبیرو نووسەرو شاعیرو ڕۆژنامەنووس لە شارەکەدا، بەڵام بەهۆی ڕژێمەوە بۆ سەر سەرجەم خاوەن قەڵەمەکانو ڕۆشنبیران بە درێژایی مێژووی سەرجەم ڕژێمەکانی عێراق بە گشتیو ڕژێمی بەعسی درندە بە تایبەتی هیچ بوارێکی بۆ بڵاوکردنەوەو دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار نەداوە بۆیە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی لەو سەردەمو قۆناغانەدا هیچ دەرکەوتنێکی بەخۆیەوە نەبینیوەو هەموو دەنگەکان کپ کراون تا وەکو پرۆسەی ئازادی عێراقو ڕزگارکردنی شاری خورماتوو.

لە دوای ساڵی (٢٠٠٣)وە ئەم شارە بۆ یەکەمینجار کەشێکی ئازادی بە خۆیەوە بینیو جووڵەیەکی ڕۆشنبیریی بە تایبەتی لە بواری ڕۆژنامەوانیدا لەو کەشە ئازادەدا زەمینەیەکی لەبار ڕەخسا بۆ دەرکردنو چاپکردنی کۆمەڵێك ڕۆژنامەو گۆڤار لە شارەکەدا لەلایەن کۆمەڵێك خاوەن قەڵەمی باشو دڵسۆز هاتنە گۆڕەپانەکەو دەستیان بەکاری ڕۆژنامەگەری کردو وێڕای نەبوونی هاوکاری مادیو دەزگای تایبەت بەو بوارە، بەڵام توانرا لە ماوەی چەند ساڵێکدا ئەم شارە ببێتە خاوەن چەندین ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەو لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی دەوڵەمەند بکەن. ئەمانەی لای خوارەوە سەرجەم ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەیە کە بەپێی پۆلینکردنی مێژووی ساڵی دەرچوونو بڵاوکردنەوەیان لە شاری خورماتوو.

**١- ڕۆژنامەی (ئاوەسپی)**

ڕۆژنامەیەکی ڕۆشنبیری گشتی بووە کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیرانی شاری خورماتوو بە زمانی کوردی دەریانکردووە.

ژمارە (سفر)ی لە بەرواری (٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی٢٠٠٢) دەرچووە.

تەنها (١٥) ژمارەی لێدەرچوو.

خاوەنی ئیمتیاز: محەمەد عەلی ئەحمەد بووە

سەرنووسەر: ئیبراهیم عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی بووە.

بەڕێوەبەر نووسین: ئەسعەد عەزیز بووە.

دەستەی نووسەران: ١- وەلید ڕەمەزان، ٢- ئەحمەد حەمید گەرمکی، ٣- فریاد داودی بووە




ڕاوێژکاری یاسایی: بەکر دەروێش بووە

نەخشەساز: ئارام لوقمان

چاپ: چاپخانەی ڕەهەند.

**٢- ڕۆژنامەی (خورماتوو)**

ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆیەو بەزمانی عەرەبی دەرچووە ژمارە (سفر)ی لە بەرواری کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣)




دەرچووە تەنها (دوو) ژمارەی لێدەرچووە.

سەرپەرشتیاری گشتی: دکتۆر فاروق عەلی عومەر

ستافی ڕۆژنامە ١- سەلاح شوکر عەلی، ٢- بەکر دەروێش، ستار جەبار.

**٣- ڕۆژنامەی (تیشکی پەروەردەیی).**

ڕۆژنامەیەکی پەروەردەیی گشتییەو بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی خورماتوو بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەری کردووە، ژمارە (سفر)ی ئەزموونی لە بەرواری (١ی تەمووزی ساڵی٢٠٠٤) دەرچووە. تەنها (٥) پێنج ژمارەی



تیشکی پەروەردەیی

Radial educational

لێدەرچووە.

خاوەنی ئیمتیاز: سەید عەدنان گەرمکی

سەرنووسەر: ئەحمەد حەمید گەرمکی

دەستەی نووسەران: ١- عومەر ئاوارە، ٢- عەدەنان محەمەد فەرەج، ٣- خالیدە جەبار.

دیزاین: ئارام لوقمان

چاپ: چاپخانەی ڕەهەند.

**٤- بڵاوکراوەی (سەدوچل):**

بڵاوکراوەیەکی بەشی مادەی (١٤٠)ی مەڵبەندی (١٦)



سەد و چل

(140)

ی حەمرینی (ی - ن - ك) بووە بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەرچووە ژمارە (سفر)ی لە بەرواری (٢٠٠٦/١٢/٢٣) دەرچووە.

تەنها (٤) چوار ژمارەی لێدەرچووە.

سەرپەرشتیاری گشتی: حەسەن محەمەد (مەلا حەسەن)

سەرنووسەر: عومەر ئاوارە

هاوکاران: ١- حەسەن ئەمین شێخانی، ٢- فریاد داودی، ٣- زانیار ڕەشاد، ٤- جەلال جاف

دیزاین: ئەحمەد محەمەد گەرمکی

**٥- ڕۆژنامەی (بانگەشەی گۆڕان).**



بانگەشەی گۆڕان

بڵاوکراوەیەکی ئازادی گشتییە دوو هەفتە جارێك بە زمانی کوردی دەرچووە یەکەم ژمارەی لە (٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦) دەرچووە.

تەنها (٢٠) بیست ژمارەی لێدەرچووە.

ساڵی (٢٠٠٧) مۆڵەتی فەرمی پێدراوە.

خاوەنی ئیمتیاز: عەلی شامیل نانەوا

سەرنووسەر: عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی

ستافی ڕۆژنامە: ١- جەلال جاف، ٢- نیهاد خورشید، ٣- هێرش سەلاح.

تایپ و دیزاین: محەمەد ئەحمەد گەرمکی.

**٦- گۆڤاری (کۆژین):**

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی ئازادە بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دوو مانگ جارێك دەرچووە، ژمارە (سفر)ی

لە مانگی ئاداری (٢٠٠٨) دەرچووە.
تەنها (٤) چوار ژمارەی لێدەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: ئیبراهیم عەبدوڵڵا ئەحمەد
سەرنووسەر: جومعە کەریم محەمەد
بەڕێوەبەری نووسین: سەلاح شوکر عەلی
دەستەی نووسەران: ١- فریاد داودی، ٢- وەلید ڕەمەزان،
کۆمپیوتەرو دیزاین: پشکۆ فەخرەدین
خاوەنی مۆڵەتی فەرمی ژمارە (٨٦٦)ی بەرواری (١٠/١٣/ ٢٠٠٨)

**٧- گۆڤاری (ئاسۆی گەرمیان)**

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتییە هەردوو نووسینگەی (خورماتوو)و (داقوق)ی کۆمەڵەی ڕووناکبیریو کۆمەڵایەتی کەرکوک دەریانکردووە.
یەکەم ژمارەی لە مانگی (ئایار)ی (٢٠٠٨) دەرچووە.
تەنها (١٠) دە ژمارەی لێدەرچووە.
سەرنووسەر: حەسەن بارام
بەڕێوەبەری نووسین: ڕووزار ئەحمەد
سەرپەشتیاری بەشی عەرەبی: ئەحمەد حەمید گەرمکی
ئیدارەوپەیوەندییەکان: ستار جەبار
نەخشە ساز: محەمەد ئەحمەد گەرمکی.

**٨- گۆڤاری (چرا).**

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی وەرزییە سەنتەری ڕۆشنبیریو هونەری چرا بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەریکردووە.
یەکەم ژمارەی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٨) دەرچووە.
تەنها (١١) یانزە ژمارەی لێدەرچووە.




خاوەنی مۆڵەتی فەرمی ژمارە (٣٢٠)ی ساڵی (٢٠٠٨).
خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: هیشام عەبدولکەریم ئەحمەد
جێگری سەرنووسەر: شیلان کاکە حمە شەریف
بەڕێوەبەری نووسینی بەشی کوردی: فریاد زەنگەنە
بەڕێوەبەری نووسینی بەشی عەرەبی: کامەران عەبدولڕەحمان
ڕاوێژکاری یاسایی: ئەحمەد حەمید گەرمکی
ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتی: عەدنان سەید شوکر.
دەستەی نووسەران: ١- سامان خورشید، ٢- سروە خالید، ٣- گەرمیان شوکر، ٤- دیار جەمال، ٥- تەلار ئیسماعیل، ٦- فریاد زەنگەنە، ٧- کامەران عەبدولڕەحمان، ٨- هەڵۆ جەباری
چاپ: چاپخانەی ئەرەبخا

**٩- ساڵنامەی (مەرگەسات)**




بڵاوکراوەیەکی ساڵانەیەو تایبەتە بە مەرگەساتی ئەنفالەوە ژمارە (سفر)ی لە ١٤ی نیسانی ساڵی٢٠٠٨ بە تیراژی (٥٠٠) دانە دەرچووە.
تەنها (١)یەك ژمارەی لێدەرچووە.
خاوەنی ئیمتیاز: خانەوادەی شەهیدان.
سەرنووسەر: عومەر ئاوارە
جێگری سەرنووسەر: عەلی شامیل نانەوا
بەڕێوەبەرانی نووسین: ١- فریاد داودی، ٢- گەشبین داودی.

**١٠- گۆڤاری (حەمرین).**




گۆڤارێکی ڕۆشنبیری مانگانەی گشتییە بە هەرسێ زمانی کوردیو عەرەبیو تورکی مەڵبەندی (١٦)ی ڕێکخستنی (ی- ن - ك) دەریکردووە.

ژمارە (سفر)ی لە مانگی کانوونی دووەمی (٢٠٠٩) دەرچووە.

تەنها (١١) ژمارەی لێدەرچووە.

خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەر: شەکرە حەمید.

لەسەرەتادا چەند ژمارەیەك عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی سەرنووسەر بووە.

جێگری سەرنووسەر: عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی

هاوکاران: ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنووسانی خورماتوو

تایپست: عیرفان لەتیف

دیزاین محەمەد ئەحمەد گەرمکی

**١١- گۆڤاری (هەنجیرە).**

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری وەرزی گشتییە بە هەرسێ زمانی کوردیو عەرەبیو تورکمانی دەرچووە.

ژمارە (سفر)ی لە (١)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩) دەرچووە.

تەنها (٤) چوار ژمارەی لێدەرچوو.

خاوەنی ئیمتیاز: ڕێکخراوی هەنجیرە.

سەرنووسەر: دکتۆر عادل گەرمیانی

جێگری سەرنووسەر: سەلاح شوکر عەلی

بەڕێوەبەری نووسین: عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی




سەرپەرشتیاری بەشی تورکمان: قاسم محەمەد تەرزی

سەرپەرشتیاری بەشی عەرەبی: جیهاد داودی.

دەستەی نووسەران: ١- وەلید ڕەمەزان کەریم، جیهاد داودی، یاسر بەیاتی.

تایپ : فەوزیە سەعید

دیزاین: محەمەد ئەحمەد حەمید.

**١٢-گۆڤاری (اليوم الجديد)**

گۆڤارێکی سەربەخۆی گشتییە لەلایەن دەزگای (الايام) بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەرچووە.

ژمارە (١)ی یەکی لە تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١١) دەرچووە.

تەنها (٢) دوو ژمارەی لێدەرچووە.

سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی: حەسەن عەبدوڵڵا سالم

سەرنووسەر: نازەنین محەمەد ڕەحیم

بەڕێوەبەری نووسین: سەلاح شوکر عەلی

سکرتێری نووسین: نەجم جەبر حەمود

سەرپەرشتیاری بەشی عەرەبی: قاسم محەمەد تەرزی

سەرپەرشتیاری بەشی کوردی: عەبدوڵڵا ئەحمەد گەرمکی

ڕاوێژکاری یاسایی: عەلی مەتەر حەسەن.

دەستەی نووسەران.

لە پارێزگای سەلاحەدین: ١- عەبدوڵڵا ئەلرەیس، ٢- عیسا عەیال، ٣- یاسر بەیاتی، ٤- دکتۆر یونس حەسەن.

لە پارێزگای کەرکوك: موئەیەد ئەلجەنابی

لە پارێزگای میسان: هەیسەم ئەلساعدی

لە پارێزگای بەسرە: ١- هودا ئیبراهیم، ٢- مونا ئەلحەلەفی




تەنها (٤) چوار ژمارەی لێدەرچووە.
سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕیو سەرنووسەر: نازەنین محەمەد ڕەحیم
جێگری سەرنووسەر: حەبیب ئەلمەلح
سکرتێری نووسین : یاسر ئەلبەیاتی.
بەڕێوەبەری نووسین: سەلاّح شوکر عەلی
سەرۆکی بەشی عەرەبی: د. ئیبراهیم مستەفا ئەلحەمەد
سەرۆکی بەشی کوردی: عەبدوڵلاّ ئەحمەد گەرمکی
ڕاوێژکاری یاسایی: عەلی مەتەر حەسەن.
بەشی هونەری: فەوزیە سەعید
دیزاین: ١- محەمەد سوڵتان، ٢- عومەر عوسمان
ئەم گۆڤارە خاوەنی مۆڵەتی فەرمییە لە بەغداوە.

لە پارێزگای دیالە: حەنان ئەلئەنساری
لە پارێزگای کەربەلا: عەلا شاکر.

**١٣- گۆڤاری (مرافيء الحرية)**

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتیی مانگانەیە بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەرچووە.
ژمارە (سفر)ی لە مانگی شوباتی ساڵی (٢٠١٣) دەرچووە



*** پێداچوونەوە بەئەزموونی رۆژنامەگەری کەرکوك**

**ستران عەبدوڵڵا**

ئەو خەسڵەتانەی رۆژنامەگەری کەرکوکی پێناسرایەوە لە دوای رووخانی رژێمی بەعسەوە، هەر ئەو خەسڵەتە دامەزراندنە خۆی ئێستا کە لە ئێستادا لە ناو بزووتنەوەی رۆژنامەگەری کەرکوکدا دەیبینی پەیوەستە بە تێروانین بۆ شاری کەرکوك وەکو کەیسێکی سیاسی، تێروانین بۆ کەرکوك لە عێراق‌و لە کوردستان‌و هەموو ناوچەکە تێروانینێکی سیاسی رووت بووەو هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵگەیەکدا مامەڵە نەکراوە کە دەشێ مردن‌و لەدایکبوون‌و ژنخوازی‌و ترس‌و ئازادی تێدایە.

*** کەیسی کەرکوك سیاسییە**

بۆ کەیسی سیاسی کەرکوك بەسەر هەموو ناسنامەکانی تری کەرکوکدا زاڵبووە لەبەر ئەوە ئەو رۆژنامەگەرییە لە دوای رووخانی سەدام حوسێنەوە لە شارەکە دروست بوو لەم خەسڵەتە بەدەرنەبوو کە زیاتر جەختکردنی لەسەر لایەنی سیاسی مەسەلەی کەرکوکە، هەروەها ئەو کەسانەی کە سەرمایەدار بوون یان ئەو کەسانەی رۆژنامەگەری کەرکوکیان پارەدار دەکرد خەرجی رۆژنامەگەرییەکان دابین دەکرد، واتە تەمویلیان دەکرد ئەوانیش لە دیدە سیاسییەکەوە سەیریان دەکرد، حیزبە سیاسییەکانی کوردستان، کەسایەتە سیاسییەکانی کوردستان، هەروەها بێگومان عێراق هەمووان دەزانین لەدوای رووخانی بەعس کەرکوك لەناو چ گێژاوێکدا بوو هێشتا نەپەرژابوونە سەر بایەخدان بەمەسەلەی کەرکوك گەر نا ئەوانیش ئەهاتن، ئەو کەسانەی کە رۆژنامەگەری عەرەبیان دروست کرد لە پاشماوەی بەعس بوون‌و تورکمانیش بۆ خۆی رۆژنامەگەرییەکی هەبوو کە سەر بە بەرەی تورکمانی بوو، ئەوەیش بۆ چالاکییەکانی خۆیان بوو، هەروەها حکومەتی هەرێم لە هەولێرەوە هەندێك لە گۆڤارو رۆژنامەی بۆ تورکمان دەردەکرد، لەبەر ئەوە ئەم تەوژمە سیاسییە پاشەکشەی کرد لەبەر کۆمەڵێك سەنگ‌و بەها، یەکێکیان ئەوەیە تەلەفزیۆن‌و رادیۆو سایت... هتد، ئەم وەزیفە سیاسییە باشتر جێبەجێ دەکەن زۆر جار وتوومە نەك تەنیا ترس لەسەر رۆژنامەگەری کەرکوکە، بەڵکو بۆ سەر رۆژنامەگەری کوردستانیشە، ترسەکەش لەسەر نەمانی خوێندنەوە نییە، ترس لەسەر رۆژنامەگەری ئەوەیە کە ئەو کەسانەی خەرجییەکانی ئەو دامودەزگا رۆژنامەگەرییانە دابین دەکەن واتە پارەداری دەکەن، بگەنە ئەو راستییە بۆ ئەوەی بتوانن ریکلام بکەن ئەوا دەتوانن ئامرازی تر جگە لە رۆژنامەی کاغەزی بەکاربێنن من پێموایە تەلەفزیۆن‌و سایتەکان دەتوانن ئەو ریکلامانە باشتر بکەن. یان تۆرە کۆمەڵایەتییەکان چونکە بەبێ بەرامبەر ریکلام دەکەن، بۆیە گەربێت‌و مومەویلی رۆژنامەگەری بکەینە چەند بەشێکەوە واتە (حیزبەکان، کەسایەتییەکان، سیاسییەکان) یان تارادەیەك سەرمایەدارەکان، چونکە دەوڵەمەندەکان ریکلام دەدەن بەدەزگاکانی راگەیاندن، بیرو باوەری ئەمان بگۆری لەسەر رۆژنامەی کاغەزی، ترسناکە ترسەکەش نەك خوێنەرانن، بەڵکو ئەوانەی تەمویلی دەزگاکان دەکەن، بۆیە ئێستا من ناوی کۆمپانیای ئاسیاسێڵم ناوە بابانوئێل چونکە دیاری دەداتە هەموو رۆژنامەکان، بەڵام گەر بزانێت تەلەفزیۆن ئەمەی بۆ دەکات‌و ئامرازێکی باشتری ریکلامە رەنگە کەمتر بایەخبدات بە رۆژنامە، ئەمە لەگەڵ دەرکەوتنی رۆژنامەگەری تەلەفزیۆن‌و رادیۆیی..

*** رۆژنامەگەری سیاسیی لە کەرکوك کەم بایەخ بووە.**

بەتایبەتی لە کەرکوکدا ئەم ئەرکە لە رۆژنامەگەری کاغەزی گرانتر بوو، دوو فاکتەری تری سیاسی هەن ئەگەر رۆژنامەگەرییەکە سیاسی بێت رۆڵێکی زۆر گەورە دەگێرێت لە پاشەکشێکردنی یەکەمیان ئەوەیە پاشەکشێی بایەخدانی سیاسی بە مەسەلەی سیاسی کەرکوك لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا، چونکە هەرێمی کوردستان سەرقاڵی کێشە ناوخۆییەکانی خۆیەتی لەنێوان ئۆپۆزسیۆن‌و حکومەت لەنێوان حیزبە سیاسییەکان، دوای بەهاری عەرەبیش دەرکەوتنی مەسەلەی کورد لە بەشەکانی تری کوردستان وەکو لە رۆژئاوا لە باکوور ئەمانە کاریگەری لەسەر بایەخی سیاسی لەسەر مەسەلەی کەرکوك داناوەو تا رادەیەك لە رووی راگەیاندنەوە پاشەکشێی پێکردو هەروەها لە ئاستی عێراقیشدا ئەم مەسەلەیە پاشەکشێی پێکرا، چونکە پرۆسەی سیاسی عێراق خۆی ئەو ململانێ دینامیکییە ناوخۆییەی ئەماو بەشێك لە ململانێی ناوچەو بەشێك لە ململانێی بەهاری عەرەبی‌و بەشێك لەو ململانێی کە ئێستا دەیبینین بوونی چەکدارانی داعش بووەتە بەربەستێکی سەربازی لەنێوان حکومەتی عێراق‌و حکومەتی هەرێمی کوردستان، لەبەر ئەوە وایانکرد گرنگیدانی سیاسی بەمەسەلەی کەرکوك پاشەکشێ بکات، کەواتە گرنگیدانی رۆژنامەگەری‌و گرنگیدان بەخەرجی پارەو توانای دارایی بۆ رۆژنامەگەری لە کەرکوکیشدا کەمی کردو ئەم بوارەی گرتەوە. بەتایبەتی رۆژنامەگەری کاغەزی خستە قەیرانەوە، چونکە رۆژنامەگەرییەکانی دیکە دەتوانن ئەرکەکان جێبەجێ بکەن، بۆ نموونە تەلەفزیۆنی کوردسات‌و گەلی کوردستان لێرەش نەبن دەتوانن لە گرتەیەکی ڤیدیۆیی لە رێگەی سۆشیال میدیاو رووماڵەکان بۆ بینەران بگوازنەوە، بە بروای من ئەمە یەکێکە لە فاکتەرەکان هی تریش رۆژنامەگەری کەرکوك پەیوەندی بە تایبەتمەندی کەرکوکەوە هەیە، چونکە شاری فرە زمانە، شاری فرە زمانیش ئەگەر دەوڵەت یان ئیدارەی شارەکە سیاسەتی تایبەتی بۆ دانەنێت دەکەوێتە گێژاوەوە.

*** زمانی کۆکەرەوەی رۆژنامەگەری.**

من کەباس لە رۆشنبیری دەکەم باس لەو ژینگەیە دەکەم کە رۆژنامەی تێدا دەخوێندرێتەوە، چونکە گەر بێت‌و جموجۆڵی رۆشنبیری نەبێت بێگومان رۆژنامەشی تێدا ناخوێندرێتەوە، بۆیە نەبوونی سیاسەتێکی رۆشنبیری‌و نەبوونی پارەدارکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە هەمیشە وادەکات

ڕۆژنامەگەری لە کۆمەڵگە فرە نەتەوەکان‌و فرە زمانەکان تووشی کێشەو گیروگرفت بىن، گەر بێت‌و لە کەرکوك تەماشای ڕۆژنامەگەری بکەین کورد بە کوردی دەخوێنێتەوە تورکمانیش بە عەرەبی دەخوێنێتەوە، بەشێکی زۆر لە تورکمانەکان لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس بەلاتینی دەنووسن‌و بەلاتینی دەخوێننەوە، لە ڕابردوو زۆرێك لە کوردەکان تورکمانییان دەزانی‌و دەیانتوانی ڕۆژنامەی تورکمانی بخوێننەوە، بەڵام دوورکەوتنەوە، چونکە زەحمەتە بەسەر بەربەرستی زمانا زاڵبێ ئینجا بێت بەسەر ئەلفابێتاشی زاڵبێ، بەڵام زمانێك جاران لە عێراق‌و بگرە کەرکوکیش دەیتوانی زمانی کۆکەرەوەی سەرجەم گرووپەکان بێت زمانی عەرەبی بوو بۆ نموونە بزووتنەوەیەکی ئەدەبی لە کەرکوکدا هەبووە بە زمانی عەرەبی (گرووپی کەرکوك) توانیویەتی ئەم کوردو عەرەب‌و تورکمان‌و مەسیحی کۆ بکاتەوە، بەڵام لە ساڵانی (١٩٦٠) بەدواوە زمانی عەرەبی واتای زمانی تەعریبکردنی وەرگرت، ئێمە ئەوەشمان لەبیر نەچێت لە پەنجا ساڵی ڕابردوو حکومڕانیکردنی ناسیۆنالیستی عەرەبی لە عێراقداو سیاسییەکانی لەیەك کاتدا عروبی‌و لە هەمان کاتدا عێراقییەکی گۆشەگیریی بوو، ئەمە وایکرد زمانی عەرەبی نەبێتە ئەو هۆکاری پەیوەندییەی کە دەیتوانی لە ساڵانی شەستەکان ئامرازی ڕۆشنبیریی‌و پەیوەندی بۆ ڕۆشنبیرێکی کوردو یان ڕۆشنبیرێکی عەرەب‌و یان ڕۆشنبیرێکی تورکمانی دروست بکات.

### * زمانێکی کۆکەرەوە نییە!

گۆشەگیری لە ڕۆژنامەوانیی عێراقی لە سەردەمی بەعسدا وابوو کە تانانەت عێراقی بەعس حەزی بە زمانی ڕۆژنامەگەری لوبنانی‌و سوری (زمانی ڕۆژنامەگەری شام)و زمانی ڕۆژنامەگەری میسری نەدەکرد. ئەم ڕۆژنامەگەرییەش بە زمانی عەرەبی بوو، بەڵام مرۆڤ هەستی بە تەعریب نەدەکرد چونکە ڕۆژنامەگەری ئەو وڵاتانە لە چاو هی عێراقی بەعس کراوەتر بوو. لەبەر ئەوە زمانی عەرەبی کە لە شەستەکان‌و تا هەفتاکان زمانی کۆکەرەوە بوو لەنێوان کوردو تورکمان‌و عەرەبی کەرکوك، لەسایەی بەعسدا وای لێهات ئەویش نەتوانێت پردی پەیوەندی بێت، بەعس حەزی لە زمانی داخراوی تەعریب بوو تا زمانی کراوەی ڕۆژنامەگەری عەرەبی، شایانی باسە کە مەرج نییە زمانی نەتەوەیەك نەتوانێت کۆکەرەرەوە بێت بۆ نەتەوەکانی تر. بۆ نموونە زمانی (بی بی سی) عەرەبی زمانێك بوو هەموو نەتەوەکانی عێراق گوێیان لێ دەگرت و لێی تێدەگەیشتن چونکە ڕاستگویی لەناوەڕۆکدایە نەك ئامرازە زمانەوانییەکە لە سەردەمی حوکمی بەعسدا، ڕێگەی تورکیاش هەم لە ڕۆشنبیریی عێراقی بە هەموو نەتەوەکانییەوەو هەم لە ڕۆشنبیریی تورکمانیش داخرابوو، بۆیە ڕۆژنامەگەری تورکمان‌و ڕۆشنبیریی تورکمانی دەریچەی نەبوو، زمانی تورکمانیش بەو حاڵەوە نەیتوانی کۆکەرەوە بێت بۆ هەمووان، زمانی کوردی لە کوردستانی دانپێدانراو (سلێمانی‌و هەولێر بۆ نموونە کە ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەعس بوون) فاکتەری

کەمەندکێش بوو بۆ ڕۆشنبیری کورد لە کەرکوك، بۆیە لەو حاڵەدا زمانێکی ڕۆژنامەوانیی‌و ڕۆشنبیریی کۆکەرەوە نەبوو لە کەرکوك بۆ هەمووان.

ئەم پاشماوەیە کارێکی کردووە لە کەرکوکی ئەمرۆشدا هیچ ڕۆژنامەیەکی لۆکاڵی نەبە کوردی، نەبە عەرەبی‌و نە بە تورکمانی ناتوانێت لە کەرکوك هەبێت‌و بمێنێت لەڕێی فرۆشی خۆیەوە، مەگەر بۆ پارێزگاکانی تری کوردستان‌و عێراقی بنێرێت. ئەمەش ئەرکێکی زەحمەتە، بەتایبەتی کە ئێستا لە عێراق‌و کوردستان جگە لە بەغدای پایتەخت دیاردەی ڕۆژنامەگەری شارەکان باوەو هیچ شارێك لەسەر حیسابی ئەویتر ئامادە نییە ڕێگەی کێبرکێی فرۆش بدات.

### * خەسڵەتی (سۆشیالیستی)

بەبڕوای من خوێنەری ڕۆژنامە لە کەرکوك دوای ڕووخانی بەعسیش هێشتا گیرۆدەی دوو خەسڵەتی کۆمەڵایەتی خراپە، یەکێکیان لەسەر شێوەی سۆشیالیستەکەی بەعس کە ئازووقەو پێداویستییەکانی ژیانی بۆ هاووڵاتی دابینکردووە ئەمەش هاووڵاتی زەرنەقوتەی لە هەموو عێراقدا دروستکرد و لە حاڵی کەرکوکدا بووە نەرتێکی کۆمەڵایەتییش، دووەمیان (سۆسیال)کەی حیزبە کوردییەکان لەپێناو کوردایەتی‌و بەرەنگاری تەعریبدا کە وایکردووە هەمووشتێکی ڕۆشنبیریی لە کەرکوك بەبێ بەرامبەر دابەش بکرێت، ئەم کارە وایکرد بازارێك بۆ ڕۆژنامەگەری کوردی لە کەرکوك دروست نەبێت‌و بێگومان بۆ تورکمانیش بە هەمان شێوە، بەڵام ئارەزووی عەرەبێکی گەرەکەکانی (وەحدە، یەکی حوزەیران، عروبە) بۆ ڕۆژنامە لە ڕێی بەغداوە پڕ دەکرێتەوە، ئێستا عەرەبێکی کەرکوك ڕۆژنامەیەکی بەغدادی دەخوێنێتەوەو بە پارەی خۆی دەیکڕێت چونکە ڕۆژنامەگەرییەکی عەرەبی بەرهەمی ناوخۆیی لە کەرکوك نییە ئێستا لە کەرکوك بواری ڕۆژنامەنووسی کوردی لێ دەربچێت، هیچ جموجوڵێکی ڕۆشنبیری عەرەب‌و تورکمان نابینین‌و لاوازە، ئەو هاوکاریانەش کە لەلایەن بەغداوە دەکرێن نەیتوانیوە ڕەوتێکی شیعری یان ئەدەبی بەتوانا لە کەرکوك دروست بکات.

لەم هەلومەرجەی ئێستا کە لە ساڵی (٢٠١٦) ڕۆژنامەگەری کوردیش لە کەرکوك لاوازە، لاوازبوونیشی بۆ دروست بوونی قەیرانی دارایی لە هەرێمی کوردستان دەگەڕێتەوە جاران حیزبە سیاسییەکانی کوردستان هاوکاری ڕۆژنامەگەری کەرکوکیان دەکرد، هاوکاری باسەرە، کەرکوکی نوێ‌و کەرکوکی ئەمرۆو بانە ڕۆژو گەڕانەوەو هتد یان دەکرد. فاکتەری هەرە گرنگ لە هاوکاری کردنی ئەم ڕۆژنامەنە ناسنامە سیاسییەکەی کەرکوك بوو کە لە چەند ساڵی ڕابردوو وەکو سێبەرێك بەسەر ڕۆژنامەگەری مابۆوە. ئەم کشوماتییەی ئێستا دەیبینین لە کاڵبوونەوەی ڕۆژنامەگەری کەرکوك لەبەر نەمانی پارەی حیزبەکان‌و پشتیوانی جارانیانە لێرەدا باس لە تەلەفزیۆن ناکەم، چونکە ئەوە حاڵەتێکی تایبەتییە، بەڵام بە بڕوای من نەتەوە زمانەو ڕۆژنامەگەری دەتوانێت نەتەوە دروست بکات، تەلەفزیۆن‌و ڕادیۆ ڕەنگە

تارادەیەك یارمەتیدەر بن، بەڵام ئەوەی نەتەوەیەك لە مردن رزگار دەکات بە بڕوای من ئەوە زمانەو ئەوە نووسراوی رۆژنامەکانە.

*** ناوەندیی رۆژنامەوانیی کەرکوك**

چارەسەر بۆ ئەمانەش سێ حاڵەتە، دۆزینەوەی ئەو کەسانەی کە رۆژنامەگەری لە کەرکوك تەمویل دەکەن، واتە کێن ئەوانەی هاوکاری مادی رۆژنامەگەری دەکەن، دووەمیان پێناسەکردنی کەرکوك وەکو ناوەندێك نەك وەکو لاچەپێك واتا برەودان بە رۆژنامەگەرییەکی ناوەندیی لە کەرکوك. هەتاوەکو رۆژنامەگەری لە کەرکوك وەکو رۆژنامەگەری لە قەزایەك سەیر بکرێت ناتوانێت ببێتە خاوەنی بەرهەمێکی رۆژنامەگەری تایبەت لە کەرکوك کە تیشك بهاوێژێت بۆ هەموو کوردستانو بگرە بۆ عێراقیش. بوونی شارێك لە ناوەندی شوێنێکا هەموو جار نیشانەی کارەسات نییە، بەڵکو هەندێك جار تایبەتمەندییەکە کە رۆژنامەگەریەکی تیشك هاوێژ بۆ عێراق و کوردستان بەرهەم بهێنێت.

خاڵی سێیەمیش بە بڕوای من گرفتی نەبوونی تایبەتمەندییە، ئەمڕۆ وڵاتان کە کارتلی گەورە دروست دەکەن لەنێوان خۆیاندا یەکێك پەنیر بەرهەمدەهێنێتو ئەوەی تریان شتێکی تر بەرهەمدەهێنێتو بەو بەرهەمەی خۆی ناسراوە. بۆیە دەبێت ئێمە ئەو نموونەیە بەسەر کەرکوك جێبەجێ بکەینو شتێك بکەین خەڵك بڵێت:- ئەمجۆرە رۆژنامەگەرییە تەنیا لە کەرکوك هەیەو کارێك بکەین خوێنەری شارەکانی دیکە بەشداری لە رۆژنامەکە بکەنو بڵێن: ئەو رۆژنامەیەی کەرکوك ئەو جۆرە خەسڵەتیانەی تێدایە، بۆ نموونە پەرە بە رۆژنامەگەری وەرزشی بدەین یان رۆژنامەگەری ئەدەبی، رەنگە کەرکوك بتوانێت ئەمجۆرە رۆژنامەگەرییە دەربکات یان رەنگە بتوانێت رۆژنامەگەری پزیشکی دەربکات، بۆیە دەبێت خەسڵەت بۆ رۆژنامەگەری کەرکوك بدۆزینەوە بە جۆرێك هەموو کوردستان ئەمە لە کەرکوك ببینێتەوەو داوا بکات ئەمەی لە کەرکوکەوە بۆ بێت. ئەگەر کەرکوك ناوەندێکی سیاسی گرنگی کوردستان بێت، ئەوا دەبێت بەشێکی پاوەری کوردستان لە بوارێکدا بگواسترێتەوە بۆ کەرکوك هەتا ئێستا ناوەندی سیاسی کوردستان سلێمانی و هەولێرە.

هەولێر وەکو پایتەخت جێگای خۆی بۆ فەراهەم کردو، سلێمانیش بە جموجۆڵی شایانی خۆی ناوی پایتەختی رۆشنبیری بۆخۆی فەراهەم کردووە، پرۆسەی سیاسی لە کوردستانا پێویستە بەشێکی بە هێزی بۆ کەرکوك بگوازرێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیا رۆژنامەگەری بۆ کوردستان بەرهەم بهێنێت، بۆیە پێویستە ئێمە لەگەڵ ئەو حاڵەتە رابێینو تێبگەین رۆژنامەگەری لە کەرکوك، گرنگیدان بە کەرکوك نابێت وەك گرنگیدان بێت بە قەزاو شارۆچکەکان، رەنگە کەرکوك خۆی وەکو چارەنووسە سیاسییەکەی پێویستی بەوە بێ ناوەندێك بێت، نەك پاشکۆی ناوەندی تر بێت، زۆر جار لە ئەزموونی رۆژنامەوانیمدا حەزم لێ نەبووە لاپەڕەیەکی تایبەت بە کەرکوك دابنێین یان لاپەڕەیەکی تایبەت بە ژنان، گەرماتوو تایبەتیشت کرد وەکو ئەوە وایە هاوکاریی نەخۆشو بەزەییت پێیا بێتەوە! ئەمەش نابێتە جێگرەوەی ئەوەی کە شوێنەکە خاوەن کەسایەتی و تایبەتمەندی خۆیەتی.

"مومەولەکانی" رۆژنامەگەری واتە ئەو کەسانەی هاوکاری رۆژنامەگەری دەکەن لە کوێن؟ بێگومان حیزبە سیاسییەکان بە پلەی یەکەم دێن، بەڵام رەنگە دوو فاکتەری تریش بڵێم کە رۆڵی گرنگ دەبینن لە پارەدارکردندا ئەویش شارەوانییەکان و سەرمایەدارەکان.

سەرمایەدار بۆ ئەوەی بەشێك لە شانازییەکانی بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەجێ بهێڵێت و بڵێت: من رۆژنامەیەکم لە کەرکوك بەو ناونیشانە دەردەکرد، رەنگە حیزبە سیاسییەکانیش هەمان رۆڵ ببینن.

شارەوانییەکان رۆژنامەیان هەبێت.

بەڵام بۆچی ناوی شارەوانیم هێناو ناوی پارێزگام نەهێنا، چونکە سەرەنجام پارێزگا دەزگایەکی سیاسییەو دواتر حکومییە، بەڵام شارەوانی چۆن پەیوەستە بە خزمەتگوزاری گشتی و جوانکاری و گوڵ و گوڵزار کە لە شوێنە گشتییەکاندا هەبێت ئاوەها پەیوەست بێت بەوەی رۆژنامەگەرییەکی باش هەبێت کە زمانەکەی و دیزاینەکەی جوان بێت و بەرهەمەکانی بڵاوی دەکاتەوە جێگەی خوێندنەوەی خەڵك بێت، بە بڕوای من دەتوانێت ئەم رۆڵە بگێڕێت، کاتی خۆی ئاگادار بووم شارەوانی کەرکوك گۆڤارێکی بەناوی "شار"ەوە دەردەکرد ئەویش بەشێکە لەو چاولێکردنە رۆژنامەگەرییەی کە هەمانە. شارەوانی دەتوانێت دووبارە کەرکوك بکاتەوە خاوەن رۆژنامەگەری و شارەکانی تر لاسایی بکەنەوە، بێگومان بۆ ئەم کارە پێویست دەکات دوورشت رووبدات یەکەمیان تەکنیکی رۆژنامەگەری وابکات لە یەك کاتدا رۆژنامەگەری بە کوردی و عەرەبی و تورکمانی بەرهەم بهێنێت و پردێکی روحی دروست بکات لەنێوان ئەو پێکهاتانەی کە زمان و کێشە سیاسییەکان لە یەکیانی دوور کردووەتەوە.

لێرە وەکو رۆژنامەنووسێك قسە دەکەم ئەگەر وەك ئەندام حیزبێك قسە بکەم بێگومان کەسمان لاریمان لەوە نییەو بگرە پێداگریش دەکەین کە کەرکوك بەشێکە لە کوردستان و چارەنووسی سیاسی پەیوەستە بە چارەنووسی سیاسی کوردستانەوە.

نموونەی وا هەیە رۆژنامەگەری بە هەموو زمانەکان هەمان ناوەرۆکی هەیە پێشموایە ئەم متبوونەی کە ئێستا لە رۆژنامەگەری کەرکوك دەیبینین سەرەتایەکە بۆ تێهەڵچوونەوەیەکی تر.

* سەرچاوە:-

- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، چاوپێکەوتن: هێمن ئەحمەد.

# بەشی سێیەم
# چاپخانەو بەرهەمە چاپکراوەکانی کەرکوک

*** چاپخانەکانی شاری کەرکوک:**

**١. چاپخانەی (الولایة):**

(کۆنترین چاپخانە لە کوردستاندا پەیدابووە، ئەویش ناوی (چاپخانەی ویلایەت) بووە، لەسەردەمی عوسمانییەکان لەلایەن (فەیزوڵڵا پاشای کوڕی حوسێن پاشاوە) لە کەرکوک دامەزراوە. ئەم هێنانی چاپخانەیەش دوای ئەوە بووە، کە کەرکوک وەکو ویلایەتێکی سەربەخۆ لە ویلایەتی موسڵ جیاکراوەتەوە. بەهەر مەبەستو ئامانجێك بووبێت، بۆ راپەڕاندنی کاروباری ئیدارەی ویلایەتەکە، یا بۆ خزمەتی باری رۆشنبیریو هونەری ئەو چاپخانەیەی لەشاری ئەستەمبوڵەوە کڕیوەو بە ڕێگەی دەریاوە بەپاپۆڕ بۆ بەنداوی رەوانە کردووەو لەوێشەوە بۆ کەرکوکی هێناوە.

وەکو ئاماژەی پێکراوە پتر مەبەستیان بەڕێوەبردنی ئیشو کاری فەرمانگەکانی ئیدارەیی و شتە رەسمییەکانی ویلایەتی کەرکوك بووە دوای پاشگەزبوونەوەی لەسەربەخۆیی ویلایەتەکە هەر بۆیە لەسەر فەرمانی (تەحسین پاشا) چاپخانەکەش گوێزرایەوە بۆ موسڵ.

زۆر بەجوانی شاعیری گەورەی کەرکوکی باسی ئەو ماوەیەو ڕووداوەکانی دەکاتو لەچەند دێرە شیعرێکدا باس دەکات:

کلدي بر مصلاوي تأريخن ديدي
المدد أولدي ولايت شهرزور

ئینجا دەڵێت:

شهرزوري موصل حدبايه الحاق ايتديلر
باق ايشه كيم قويديلر قنبوري قنبور اوستنه

هەر بۆیە (صاق) شاعیر لەشیعرێکدا ساڵی (١٢٩٦) کۆچی بە ساڵی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە دیاریکردووە، کە دەکاتە بەرامبەر ساڵی (١٨٧٨– ١٨٧٩) زایینی.

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە بە پێی شیعرەکە ساڵی (١٨٧٨) ئەم چاپخانەیە لە کەرکوك هەبوو، بەڵام هەندێك سەرچاوەی تر باس لە ساڵی (١٨٨١) دەکەن لە دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە لە کەرکوك.

بەڵام بەپێی ئەو سەرچاوانەی (عەتا تەرزی باشی) باسی کردووە ئاماژە بەوە دەکات کە لە ساڵی (١٨٧٩) ئەم چاپخانەیە لە کەرکوك دامەزراوە.

چاپخانەی (الولایة) چاپخانەیەکی بەردی بچووك بووە بە لیتۆگراف کاری کردووە، کاری چاپکردنی کاروبارەکانی ولایەتەکە بووە، وەکو خشتەی (الفائض والبدلات والوصلات) ی فەرمیو کارووباری باجو سەرانەی ولایەتەکە، هەر بۆیە هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە رۆژنامەی (ژورنال) لەوانەیە لەم چاپخانەیە چاپکرابێت.

لە سەرەتای مانگی مایسی ساڵی (١٢٩٨)ی رۆمی، تەحسین پاشا دامەزرا بە والی لەسەر موسڵ، لەو کاتەدا کەرکوك ناوەندی وولایەتەکە بووە تاکو هەفتەی دووەم لە مانگی (ئۆغستۆس) لە هەمان ساڵدا کە والی پێشوو (محەمەد مونیر پاشا) دامەزرا لە کەرکوك.

لەو ماوەیە چاپخانەی (الولایة) لە بارێکی زۆر ناهەمواردا بوو تەنانەت لە توانایدا نەبوو پێویستییەکانی وولایەتەکە چاپ بکات، لەبەر ئەوەی زۆر کاری کردبوو، کەموکورتی تێکەوتبوو و کاروبارەکانی زۆر بە هێواشی بەڕێوە دەبردو بەردەکانی شکانی تێ کەوتبوو.

هیچ زانیارییەکمان نییە دەربارەی چاپکردنی چاپخانەکە، بەڵام نووسراوێك هەیە لە (٣)ی کانوونی دووەمی (١٢٩٨)ی رۆمی ئاماژە بەوە دەکات لە کاتی رۆیشتنی والی بۆ مەڵبەندی ولایەت لە موسڵ لەگەڵ خۆیدا چاپخانەکەی بردبێت، چونکە مەڵبەندی ولایەت لە کەرکوك گوازرایەوە بۆ موسڵ.

جەبار جەباری لە کتێب (تأريخ الصحافة الكوردية) ئاوها باسی کۆتایی ئەم چاپخانەیە دەکات:

"ئەوەی شایانی باسە هێشتا چەند مانگێك تێپەڕی نەکردوبوو بەسەر بوونی کەرکوك بە ویلایەت، حکومەتی عوسمانی لە بڕیارەکەی پاشگەز بووە، دووبارە جێگای ویلایەتی لە کەرکوك گواستەوە بۆ شاری موسڵ، فەیزی پاشا بۆ لایەکی تر رەوانە کراو تەحسین پاشا هاتە جێگاکەیو یەکسەر بڕیاری دا کە ئەو چاپخانەیە لە کەرکوك بگوێزرێتەوە بۆ شاری موسڵ، ئەمەش بووە مایەی داخێکی گەورە لە دڵی دانیشتوانی شارەکەدا، بۆیە چەند شاعیرێکی شارەکە ئەو ڕووداوە ناخۆشەیان بە شیعری پاراو دەربڕیوە، کە پاش ئەوەی والی تەحسین پاشا لە موسڵ جێگیری دەبێت لە ساڵی (١٣٠١)ی رۆمیدا رۆژنامەی (الموصل) لەو چاپخانە چاپ ئەکات، کە یەکەم رۆژنامەیە لە شاری موسڵدا لە ساڵی (١٨٨٥)ەوە تاکو ساڵی (١٩٢٤) دەرچووە".

**٢. چاپخانەی (الصنائع):**

یەکەم قوتابخانەی پیشەسازی لە کەرکوك لە ساڵی (١٨٧٠)ی زایینیی لەلایەن خەڵکی کەرکووکەوە کراوەتەوە، لە سەرەتادا قوتابخانەیەکی پێشکەوتوو بووە، بەڵام لە دواییدا وورده وورده بەرەو دواکەوتن ڕۆیشتووە.

لە سەردەمی (فەیزی پاشا) مووتەسەڕیفی کەرکوك لە ساڵی (١٨٧٩) بەرەو پێش چووە، بەڵام لە دواییدا بەرەو دوا چۆتەوە، لە سەردەمی موتەسەڕیفی کەرکوك (عەونەڵڵا کازمی) زۆر پێشکەوتنی بە خۆیەوە دیووەو بەرەو پێش چووە، هەر بۆیە لە دوای شەش ساڵ لە دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٨٧٦) یاداشتنامەیەك لەلایەن قوتابییانەوە بەرزکراوەتەوە، ئەوە خراوەتەوە ڕوو کە چەند گیروگرفتێکیان هەیەو پێویستییان بە چارەسەر هەیە.

کاتێك (محەمەد عەونەڵڵا کازمی) کە زانایەکی ئاینییە کرا بە موتەسەڕیفی کەرکوك لەساڵی (١٩١٠) لەلایەن سوڵتان (عەبدولحەمید)ەوە دەستی کرد بەکردنەوەی قوتابخانەی (صناعي) سوڵتانی لە کەرکوك، کە لەگەڵ قوتابخانەکەدا چاپخانەیەکی تایبەتیشی بۆ دروستکرد لە ساڵی (١٩١١)ی زایینیی، کە بەڕێوەبەری قوتابخانە لە (ئەستەنبوڵ) بە (١٥٠٠) لیرەی عوسمانی کڕی لەسەر ڕەزامەندی موتەسەڕیفی کەرکوك.

موتەسەڕیفی کەرکوك هەستا بە کڕینی چاپخانەو چاپی لیتۆگرافو ڕاکێشانی دەستی (چاپکردن بروفات) لەگەڵ کڕینی ١٧ سەندوق لە پیتی چاپکردن، ئەم چاپخانەیە لە ڕێگای دەریاوە لە بەسرەوە هێنراوەتە بەغداو ئینجا لە ڕێگای وشکانییەوە گەیشتووەتە کەرکوك.

شاعیری کەرکوکی هیجری دەدەی کاکەیی لە دێرە شیعرێکدا باس لە مێژووی ئەم چاپخانەیەی کردووە:

بر مقدس روح رواندر مطبعة

ناشر فيض حقيقت ترجماندر مطبعة

هەر یەکە لە ڕۆژنامەی (حوادث)و (اژانس ژورنالی)و گۆڤاری (معارف) لەم چاپخانەیە چاپکراوە.

لەو کتێبانەی لەم چاپخانەیە چاپکراوە بریتی بووە لە:

* **(عمدة القواعيد):**

– لە نووسینی تاهیر نادر دوریکلی، لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی ڕێزمانی تورکیو عەرەبیو فارسی بە زمانی تورکیو لە (١١٢) لاپەڕەدا لە ساڵی (١٩١٢) چاپکراوە.

* **(وسيله حسنى):**

– لە نووسینی شاعیری کەرکوك عەبدوڵڵا قودسی زادە کە بریتییە لە (١٦) لاپەرە.

* **(عربى درسلرى – الدّروس العربيه):**

– کتێبێك بوو بە زمانی تورکی لە نووسینی سلێمان سامی باتوملی دەربارەی (الصرف العربي)، کە بریتی بووە لە (١٣٠) لاپەرە.

* **(آثار حسن):**

– ئەم کتێبە لە نووسینی (حەسەن حوسنی تکریتلی زادە) بوو بە زمانی تورکی لە ساڵی (١٩١١)و بریتی بووە لە (٥٠) لاپەرە.

* **(تّصريف الزنجانى):**

– لە نووسینی شێخ ئیبراهیم زنجانی بووە لە قەوارەی (١٢٠) لاپەڕە لە ساڵی (١٩١٢).

* **(سّراح الطالبين):**

– بە زمانی فارسییەو لە نووسینی عەلی نەقشبەندی خالیدی حیسامی بووە کە بەشی یەکەم بریتی بووە لە (٢٨٦) لاپەڕە.

* **(ماتم):**

شیعرێکی درێژە کە شاعیر نەسیمی زادە خەلوسی بەدلیسی نووسیوویەتی دەربارەی کۆچی برای لە (٢٤) لاپەڕەو لە ساڵی (١٩١١).

* **(مفتاح حقيقت):**

– چامەیەکی شیعریە بە تورکی هی شاعیر نەسیمی زادە خەلوسی بەلدیسییە لە (٢٤) لاپەڕەداو لە ساڵی (١٩١٣) چاپکراوە.

* **(ألواح سبعه):**

لە بەرهەمی نەسیمی زادە خەلوسی بەدلیسی بووە لە ساڵی (١٩١٤) بە چاپ گەیاندراوە.

* **(تربيه بدنيه ومكتب اويونلرى):**

– بە زمانی تورکی بووەو لەلایەن فەتحی سەفوەت نووسراوە دەربارەی وەرزشیو پێویستییەکانی لە قەبارەی (٣٦) لاپەڕەدا.

* **(ديوان حيپيت قانوننامەسى):**

– ناوی نووسەری لەسەر نییە دەربارەی قانوونی تایبەت بووە بە (قانون مجلس الانضباط).

ئەم چاپخانەیە چەند کتێبو گۆڤارو نامەی جۆر بەجۆری پێ چاپکرد، ئەم چاپخانەیە بەردەوام بوو لەچاپکردن هەتا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، کە کاربەدەستانی بەریتانی چاپخانەکەیان لەکار خستو دوای ئەوەی چاك کرایەوە ناردیانە (بەغدا) بۆ چاپکردن.

**٣. چاپخانەی (الحوادث):**

ڕۆژنامەنووس (ئەحمەد مەدەنی) لە ساڵی (١٩١١)دا ئەم چاپخانەیەی هێنایە شاری کەرکوك لە (بەلجیکا)وە، کە ڕۆژنامەی (الحوادث)ی پێ چاپکرد، بەڵام لەدوایدا ناچار بوو کە بیفرۆشێت، هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی (١٩١٨)دا ڕۆژنامەی (نجمة)یان پێ چاپکرد، بەڵام لەدوای ئەوەی کە بەریتانیا کشایەوە لە کەرکوك، شارەوانی کەرکوك چاپخانەکەی وەرگرت، بەکاری دەهێنا بۆ چاپکردنی کاروباری تایبەتی شارەوانیو گشتی کە تا ماوەیەکی دوورودرێژ لە گەنجینەی شارەوانی خۆڵو تۆز داپۆشیبوو. لەسەرەتادا چاپخانەکە لە بازاڕی گەورە لە تەنیشت قەیسەری قیردارەکان لە نزیك بنکەی پۆلیسی کۆن دامەزرابوو.

لەنێوان ساڵانی (١٩١١-١٩١٢) ڕۆژنامەی (حوادث) لە چاپخانەی (حوادث) چاپكراوە لەگەڵ ڕۆژنامەكانی (تجدد) و (كركوك)دا.

دەربارەی ئەو كتێبانەی لەم چاپخانەیە چاپكراوە تەنها كتێبی (ترجیع بندویا انتباه ملت) بە زمانی توركی و لە قەبارەی هەشت لاپەرە، كە لەلایەن هیجری دەدەی كاكەییەوە نووسراوە كە ئەوكاتە مامۆستای زمانی فارسی بووە لە قوتابخانەی سوڵتانییە لە كەركوك.

لە دوای ئەوەی ئینگلیزەكان كەركوكیان داگیر كردوو عوسمانییەكان كشانەوە لە كەركوك لە ساڵی (١٩١٨)دا بەڕێوەبردنی كاروباری چاپخانەی (حوادث) چووە ژێر دەستی ئینگلیزەكان لە ڕێگەی بە كرێ گرتنی لەلایەن شارەوانییەوە لەلای خاوەنەكەی محەمەد زەكی، بەڵام لە دواییدا شارەوانی چاپخانەكەی كڕی لە كۆتایی ساڵی ١٩١٩و گواستیەوە بۆ شوێنێكی دیاری كراو لە (دار الحكومة) لە مانگی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٠) لەو كاتەی ئینگلیزەكان ڕۆژنامەی (نجمة)یان دەردەكرد لە چاپخانەی (حوادث) بە چاپیان دەگەیاند، بەڵام وورده وورده چاپخانەكە بەرەو كاولبوون دەچوو، پەككەوتنی وای كرد كە چاكسازی تێدا بكەن ئەویش بە زیاد كردنی چوار (ڕۆڵە) بۆ ئامێری چاپكردنەكە، لەگەڵ هێنانی سەندوقی تری ووشەو پیتەكان، بەڵام هەموو ئەمانە دادی چاكردنی نەدەداو چاپكردنی لە بارێكی زۆر نارێكدا بوو.

بۆیە وورده وورده چاپكردن لەم چاپخانەیە بەرەو راوەستان دەڕۆیی و پەكی كەوت و بە كەڵكی چاككردنەوە نەدەهات.

**٤. چاپخانەی (شارەوانی):**

لە سەردەمی عوسمانییەكان و لە كاتی هاتنی ئینگلیزەكاندا شارەوانی چاپخانەی (حوادث)ی كڕی و ماوەیەكی كەم بەكاری هێنا بەڵام لەبەر زۆری كاروباری بەڕێوەبردن و لەبەر خراپی چاپخانەكە، كاروبارەكانی لە كار كەوت.

لە دواییدا شارەوانی هەستا بە كڕینی چاپخانەیەكی تر لە (٣١)ی تەمووزی ساڵی ١٩١٩، ئەم چاپخانەیان لە ئینگلتەرا كڕی كە بە دەست كاری دەكردو لەبەرهەمی ئەمریكی بوو كە كۆمپانیای (كیفلاند اوهایو Kefland ohaio) دروستی كردبوو، لەو ساڵەدا گوازرایەوە بۆ ئیتاڵیا بۆ هێنانی بۆ شارەوانی.

لە ساڵی (١٩٥٩)دا شارەوانی كەركوك هەستا بە كڕینی چاپخانەی ئەڵمانی ماركەی (هایدلبێرغ) لەگەڵ هەموو بەشەكانیدا ئەمەش وای كرد كاركردن لەو بوارەدا فراوان بوون بە خۆیەوە ببینێت.

دوو پارچەی یەكەمی قەبارەیەكی ناوەندیان هەبوو بە قەبارەی (٥٠×١٠)و ئەوی دووەمیان بە قەبارەی (١٥×١٠) بە هۆی ئەم چاپخانەیەو كرێكاری بە توانا لەم بوارەدا توانیان پێویستییەكان راپەڕێنن.

ئەم چاپخانە تازەیەی شارەوانی دەورێكی باڵای بینی لە چاپكردنی ژمارەیەكی زۆر لە گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوكراوەو كتێب و بەرهەم و نامەی جۆراوجۆرو پێویستی خەڵكی لە شارەكەدا.

گەورەترین چاپكردنی ئەم چاپخانەیە چاپكردنی ڕۆژنامەی (كركوك) بوو هەر لە (٢٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٠) تا وەستانی لە گۆرەپانی ڕۆژنامە نووسی كەركوك لە (٢٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧٢) كە ماوەیەكی چاك ئەم ڕۆژنامەیە بە زمانی عەرەبی و توركی و كوردی دەردەچوو.

ئەو كتێبانەی لە چاپخانەی شارەوانی چاپكراوە:

* (**شهیدلری اگاركن**):

- بە زمانی توركی بە قەبارەی ٤٦ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٠ لەلایەن (مەولود تاها قایاچی)یەوە نووسراوە.

* (**فن الرسم**):

- بە زمانی عەرەبی و بە قەبارەی ٨٤ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٠ لە نووسینی مەحمود عوبێدی.

* (**سەویلەن ماعنیلر**):

- بە زمانی توركی و لە (٣٧) لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦١، بەرگی یەكەم لە نووسنی ئەحمەد فكری.

* (**كیف تصنع المجسمات**):

- بە زمانی عەرەبی و بە قەبارەی (٦٤) لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦١ لەلایەن شێوەكار مەحمود عوبێدی.

* (**صرخه العمالقه**):

- لە نووسینی ئەحمەد سویحی و بە زمانی عەرەبی و لە قەبارەی ٤٦ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٣ چاپكراوە.

* (**اربیلان بیرسس**):

- لە نووسنی محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، بریتیە لە ٣٤ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٤ چاپكراوە.

* (**گنج ادبیاتچلرمزی گانیالم**):

- لە نووسینی گنج گوپلومی، بە قەبارەی ٨٨ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٣ چاپكراوە.

* (**سس سنعتكالریمز قیلاووزی**):

- لە نووسینی ئەحمەد ئوگراقچی بە قەبارەی ٨٠ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٤ چاپكراوە.

* (**جوشقون دویغولوم**):

- لە نووسینی محەمەد سادق، بە قەبارەی ٤٤ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٤ چاپكراوە.

* (**عبث الشیاطین**):

لە نووسینی سەیفەدین ئیسماعیل، بە زمانی عەرەبی، بە قەبارەی ٨٠ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٥ چاپكراوە.

* (**گورگور بابایە سلام**):

- لە نووسینی ئیسماعیل سرت تروكمن، بە زمانی توركی بە قەبارەی ٦٤ لاپەڕەو لە ساڵی ١٩٦٥ چاپكراوە.

* (**گوگلدن اهلر**):

- لە نووسینی كەمال رەجەب حەسەن و موسا بەكتاش، بە زمانی توركی، بە قەبارەی ١٤٤ لاپەڕە ساڵی ١٩٦٦ چاپكراوە.

* (**عبد الواحد گوزەچی اوغلی نك خوبرات و سبتەلری**):

- بە زمانی توركی بە قەبارەی ٨٠ لاپەڕە لە ساڵی ١٩٦٦ چاپكراوە.

* کتێبخانەی (تبارك):
لەلایەن (حازم نازم کەهیە) دامەزراوەو لەو لقەی کە دەچێت بۆ مەحاکم لە تەلاری (عەبدولوەهاب ئاوچی).

* کتێبخانەی (سوبحی عەلی):
ئەم کتێبخانەیە لە شاترلو بوو لە پشت ماڵی پارێزگار.

* کتێبانەی (حوسێن عەلی غالب):
ئەم کتێبخانەیە لە بازاڕی قۆریە بوو لە گەڕەکی (جریت مەیدان).

* کتێبخانەی (دار القراء):
خاوەنەکەی (ئەبو محەمەد) بوو لە (مجمع القرطاسیة) لە لای مەحاکم.

* کتێبخانەی (المتنبی):
لە (مجمع القرطاسیة) بوو لەلای مەحاکم.

* کتێبخانەی (سەلاح بەهلول عەلی):
لە شەقامی کۆماری بوو لە تەلاری (ابی حنیفە).

* کتێبخانەی (سامی حەبیب مەیاس):
لە گۆڕەپانی مەحاکم بوو لە نزیك ئەوقاف.

* کتێبخانەی (الطالب):
ئەم کتێبخانەیە لە شەقامی ئەتڵەسە، کە زیاتر کتێبو پێویستی قوتابخانە دەفرۆشێت.

* کتێبخانەی (ئەسیری):
لە شەقامی ئەتڵەس کراوەتەوە، هەر لە پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراقەوە بەردەوام بووە لە فرۆشتنی کتێبی کوردیو عەرەبیو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان، خاوەنی کتێبخانەکە (عیرفان نەجم)ە، بەڵام ئێستاکە وازی هێناوە.



* کتێبخانەی (کەرکوك):
لە شەقامی بەرامبەر چاپەخانەی مەجیدیەیە کراوەتەوە، دابەشکەری ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیو عەرەبییەکانە لە کەرکوك.

* کۆشکی (عەلی مەردان):
بەرامبەر بانقی سەرەکی کەرکوك، خاوەنەکەی (مەسلیح شالی)یە، هەر لەپرۆسەی ئازادی عێراقەوە کراوەتەوە، گەلێك کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤاری عەرەبی فرۆشتووە، بەڵام ئێستا لەکار وەستاوە.

* کتێبخانەی (ڕۆژ):
ئەم کتێبخانەیە لەدوای پرۆسەی ئازادییەوە لە شەقامی کۆماری لەلایەن سەباح موسا وە دامەزراوە بۆ فرۆشتنی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤار.



* کتێبخانەی (ژووانی نووسەران):
لەلایەن مامۆستا بەکر بەرامبەر گەڕەکی شوان کراوەتەوە، زیاتر کتێبی عەرەبیو کوردیو ئینگلیزی دەفرۆشێت.

* کتێبخانەی (مەترانییەی کەرکوك):
– یەکێکە لە کتێبخانە دەوڵەمەندو گرنگەکانی کەرکوك کە نزیکەی پێنج هەزار کتێبی جۆراوجۆری ئایینی و مێژوویی و دەستووری ئایینی مەسیحی تێدایەو لەلایەن مەترانی کڵێسەکانی کەرکوکەوە سەرپەرشتی دەکرێت و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك پۆلێن کراوە بۆ ئەوانەی کە سوودی لێ دەبینن لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیدا.

* کتێبخانەی (گشتی کەرکوك):
یەکێکە لە شوێنە ڕۆشنبیرییە گرنگەکانی شارەکەو جێگەو توانایەکی چاکی هەبووە لە خزمەت کردنی شارەکە دا لەکۆ کردنەوەی ژمارەیەکی زۆری کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤار بەزمانەکانی کوردیو وعەرەبیو تورکمانیو ئینگلیزیو فەرەنسی.
کتێبخانەکە وەکو شارەکە کەوتە بەر شاڵاوی تەعریبو تاڵان کردنی لەلایەن بەعسەوەو فەوتاندنی بەشێکی زۆری



کتێبخانەی ئەمەل



مەلا محەمەد مەلا عەلی ئەترەقچی



کتێبخانەی ڕێگا



کتێبخانەی کۆمپانیای کەرکوک



کتێبخانەی بەهجەت غەمگین

ڕۆژنامەو گۆڤارو كتێبی كوردی جۆر بەجۆر سووتاندنی بەتایبەتی لەدوای ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٢)دا، وهێنانی بەڕێوەبەری عەرەبو بەعس بۆ كارڕایی كردنی كارەكانیان.
ئەم كتێبخانەیە لە ساڵی (١٩٣٧) لەجێگە قوتابخانەی (اهلی مسائی) دروست كراوە كە بەڕێوەبەرەكەی (عەلی حیكمت) بوو، پارچە زەوییەكەی كە كتێبخانەكەی لێ دروست كراوە دەگەڕێتەوە زەویو زاری مزگەوتەكەی سەید ئەحمەدی خانەقا.
ئەوەی تاكو ئێستا لە كتێب لەو كتێبخانەیە پارێزراوە لە كتێبی كوردیو عەرەبیو توركیو ئینگلیزیو فەرەنسی نزیكەی (٢٣٧٦٨) كتێبە.
ڕێژەی كتێبە عەرەبییەكان (٢٠٦٤١) كتێبە، ڕێژەی كتێبە كوردییەكان (١٢٩٤) كتێبە، ڕێژەی كتێبە توركییەكان (٨٥٠) كتێبە ڕێژەی كتێبە ئینگلیزییەكان (٩٦٥) كتێبە ڕێژەی كتێبە فەرەنسییەكان (١٨)كتێبە.

*** هەندێك لەبەڕێوەبەرەكانی كتێبخانەی گشتی كەركوك:**

بەڵام لەنێوان ساڵانی (١٩٣٧-١٩٥٢) هەر یەكە لەم ناوانەی خوارەوە بەڕێوەبەر بوونە لە كتێبخانەی گشتی كەركوك:

١. محەمەد مەلا ئەحمەد.
٢. عەبدولئەزەل موفتی.
٣. مەهدی موعەزەز.
٤. كەمال حەسون.
٥. نەعیم زەیا كەمۆ.
٦. عەبدولحەمید بیلال.
٧. ڕەشید دیونی.
٨. عەباس عەبدولخەلەف.
٩. مارین جۆرج.
١٠. كامل جاسم عانی.

بەڵام لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-٢٠١٦) ئەم بەڕێوەبەرانە كاریان كردووە لە كتێبخانەی گشتی كەركوك:

١. یەعقوب نەدیم، ١٩٥٢-١٩٥٧.
٢. شێخ ڕەئوف خانقا، ١٩٥٧-١٩٦٧.
٣. شێخ تەحسین حەبیب تاڵەبانی، ١٩٦٧-١٩٨٨.
٤. عەبد عەزاب غالی، ١٩٨٨-١٩٩١.
٥. زوهدی فەیزوڵڵا، ١٩٩١-١٩٩٥.
٦. حەسیبە عەزیز عەبدوڵڵا، ١٩٩٥ - ١ی نیسانی٢٠٠٢.
٧. بورهان خەلیل ئیبراهیم، ١ی نیسانی٢٠٠٢ - ٢٠٠٢/٩/١.
٨. هاشم فەرحان ئیسماعیل، ٢٠٠٢/٩/١ - ١٦ی نیسانی٢٠٠٣.
٩. بورهان خەلیل ئیبراهیم، ١٦ی نیسانی٢٠٠٣ - ٢٠٠٦.
١٠. شادیە بەكر، ٢٠٠٦- تاوەكو ئێستاكە بەردەوامە.

| ژ | ساڵ | كتێبی عەرەبی | كتێبی كوردی | كتێبی توركی | كتێبی فارسی | كتێبی ئینگلیزی | كتێبی فەرەنسی | كتێبی ئەڵمانی | كتێبی سریانی | كتێبی عیبری | كتێبی ئەرمەنی | كتێبی یۆنانی | زمانەكان تر | كۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٣٦-١٩٣٧ | ٥٥٥ | ٢ | ١٨٤ | ٣ | ٣٢ | - | - | - | - | - | - | - | ٧٧٦ |
| ٢ | ١٩٣٨-١٩٣٩ | ١٢٤٤ | ٩ | ٢٣٤ | ٤ | ٤٨ | ١٠ | ٥ | - | - | - | - | - | ١٥٥٤ |
| ٣ | ١٩٤٣-١٩٤٤ | ١٦٠١ | ٢٩ | ٢٩٠ | - | ٣١٢ | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٢٢٣٥ |
| ٤ | ١٩٤٤-١٩٤٥ | ٢١٣٦ | ٢٧ | ٢٩٠ | ٢ | ٣٧١ | ٦ | - | - | ٢ | - | - | ١ | ٢٨٣٥ |
| ٥ | ١٩٤٦-١٩٤٧ | ٢٥٥٨ | ٢٩ | ٢٩٥ | ٢ | ٤٠٢ | ١ | - | - | ٢ | - | - | ١ | ٣٢٩٠ |
| ٦ | ١٩٤٧-١٩٤٨ | ٢٤٦٠ | ٢٧ | ٢٧٧ | ٢ | ٤٣٨ | ١ | - | - | - | - | - | - | ٣٢٠٨ |
| ٧ | ١٩٤٨-١٩٤٩ | ٤٨٢٥ | ٣٢ | ٢٩٥ | - | ٥٨٨ | ٥ | - | - | ٢ | - | - | - | ٥٧٤٧ |
| ٦ | ١٩٤٩-١٩٥٠ | ٦٧٢١ | ٨٤ | ٤٧ | - | ٧٠٤ | ٦ | - | - | ٢ | - | - | ١ | ٨٠٣٨ |
| ٧ | ١٩٥٠-١٩٥١ | ٧٣٨٨ | ٩٣ | ٤٧١ | - | ١٠٣٩ | ١٠ | - | - | ٢ | - | - | ١ | ٩٠٠٤ |
| ٨ | ١٩٥١-١٩٥٢ | ١٠٤٣٧ | ١٠٨ | ٥٧٧ | - | ١٦٩٧ | ٧٤ | - | ١ | ٢ | - | - | ١ | ١٢٨٩٧ |
| ٩ | ١٩٥٢-١٩٥٣ | ١٢١٢٤ | ١٢٠ | ٦١٥ | ٢٦ | ٣٠٠٨ | ١١٦ | ٢ | ١ | ٢ | ١٥ | - | ١٩ | ١٦٠٤٨ |
| ١٠ | ١٩٥٣-١٩٥٤ | ١٢٧١٤ | ١٩٣ | ٨٤٠ | ٢٦ | ٣٥٠٠ | ١٤٩ | ٤ | ١ | ٢ | ١٥ | - | ١١ | ١٧٥٣٥ |
| ١١ | ١٩٥٤-١٩٥٥ | ٤٥٧٢ | ٢١٢ | ٤٦٠ | ٢٦ | ٣٥٠ | ١٨٠ | - | ١ | - | - | - | ٨ | ٥٨٠٩ |

لە سەرەتای دامەزراندنیان هەر یەکە لە کتێبخانەی گشتی چەمچەماڵ و کفری سەر بە کتێبخانەی گشتی کەرکوك بوونە.

*** کتێبخانەی (گشتی کفری):**
ئەم کتێبخانەیە لەساڵی ۱۹٦۳ دامەزراوە.

*** کتێبخانەی (گشتی چەمچەماڵ):**
ئەم کتێبخانەیە لە ساڵی ۱۹۷٦ دامەزراوە.

*** کتێبخانەی (گشتی کەلار):**
ئەم کتێبخانەیە لە ساڵی ۱۹۸۳ دامەزراوە.

*** کتێبخانەی (گشتی قەرەهە نجیر):**
ئەم کتێبخانەیە لە ساڵی ۲۰۰٤ دامەزراوە.

*** کتێبخانەی (گشتی سەرقەڵا):**
ئەم کتێبخانەیە لە ساڵی ۲۰۰٤ دامەزراوە.

*** کتێبخانەی کارێز**

تاریق کارێزی

نەمویست لاسایی رۆژاواییان بکەمەوە، ناوی ئەم شوێنە بنێم (ماڵ) یان (سالۆن) یان (سەنتەر). وام بە باشتر زانی ناوێکی گونجاوی کوردیی لێ بنێم. هەڵبەت ناو هێندەی ناوەرۆك گرنگ نییە. چاوەروانم ئەم کونجە سادە و بچووکەی من بە ناوی (کتێبخانەی کارێز) ناوەدانم کردووەتەوە، دوا جار ببێتە لانە و پەناگەیەك بۆ ئەوانەی وێڵی دنیای زانین و هونەر و وێژە و فەلسەفە و زانستن.
(کتێبخانەی کارێز) بەو نیاز دەکرێتەوە، کە بتوانێ ببێتە جێیەك بۆ گرێدانی کۆڕ و سیمینار و دیدار. شوێنێك بێت بۆ خوێندنەوە، نووسین، لێکۆڵینەوە. جێی ئەوەشی تێدا دەبێتەوە، کە بژاردەی رۆشنبیر و رووناکبیر و هۆشمەند و عاقلمەندانی شار و وڵاتەکەمان، گفتوگۆی جوان و چاك و بەرهەمداری تێدا بکەن. لێرەوە شیلەی هزری رووناك و رۆشنی خۆیان، بەرەو گۆشە تاریکەکانی ژیانی گەل و نەتەوەکان ئاراستە بکەن. (کتێبخانەی کارێز) مێرگێکە بۆ ئاشنا بوون بە کولتووری رەسەن، سەنگین، دێرین و دەولەمەندی کورد و مێژووی کوردستان. ئەگەرچی کتێبخانەیەکی زۆر سادە و بچووك و ساکارە، بەڵام چاومان لەوەیە هێندەی مۆمێکی بچووك، رۆشنایی بدات و ببێتە بەردەبازی رێی بەرەو ئامانجی پیرۆز. نووسەران و توێژەران دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان سوود لە سەرچاوەکانی وەربگرن. سیستەمی کتێبخانەی کارێز وایە، هیچ چاپەمەنی و بەڵگەنامەیەکی لێ ناچێتە دەرێ، بەڵکوو پێشوازی لە هاتنیان دەکات. هەر لە نێو کتێبخانەدا، هەموو کەس بۆی هەیە سوود لە سەرچاوەکان وەربگرێت. هاوکات بە رووی منداڵانی کوردستان و قوتابی و خوێندکارانی هەموو قۆناغەکانی خوێندنیشدا کراوەیە، کە بێن سەردانی بکەن و سوود لە سەرچاوەکانی وەربگرن.

*** تاریق کارێزی کێیە؟**
بە گوێرەی ناسنامەکەم بێت، لە ۱۹٦۱/۷/۱دا، بەڵام بە گوتەی مامی گەورەم بێت لە ۱۹٥۹/۹/۹دا لە گوندی کارێز (۱۲ کیلۆمەتر رۆژهەڵاتی تەقتەق) لەدایك بووم. ناوی تەواوم (تاریق سدیق حاجی حەمەدەمین مستەفا حاجی عومەر)ە. لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمدا لە هەولێر و رەواندزدا ژیاوین. دوای دەستگیر کردنی باوکم و دوورخستنەوەی بۆ باشووری عێراق، لەنێوان ساڵانی ۱۹٦٤ تا ۱۹۷۳ لە شاری کووت ژیاوین. لەوێدا زۆربەی بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستام، تا چیاکانی ئیلام و لورستان ببینم (چیا وڵاتی منە). ئەو هەستە لە ناخەوە خۆرسکانە هەڵدەقوڵا. لە ساڵی ۱۹۷۳ گەراینەوە کەرکووك. هاتنەوەی خێزانەکەمان بۆ کوردستان، وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە ژیانم. لە کووت هەستم دەکرد، کە ئێمە کوردین و خەڵکی ئەو شوێنە نین. عەرەبی کووتیش ئێمەیان بە کورد نەدەزانی، "ئێمە لەلای ئەوان باکووری بووین، واتە خەڵکی باکووری عێراقین: بە زمانی ئەوان: شیمالی، شمالییە بووین." کوردی شارەکەش، کە کوردی فەیلی و بە رەسەن خەڵکی ئەوێن، عەرەبی کووت ئەوانیان بە کورد دەزانی. دوای ئەوەی گەراینەوە کەرکووك زۆر بە کەم کوردیم لەبیرمابوو. خێزانەکەمان لە گەرەکی ئیمام قاسم نیشتەجێ بوو، من تێکەڵی منداڵان نەدەبووم، چونکە ترسی ئەوەم هەبوو گاڵتە بە کوردییەکەم بکەن، سڵم لەوە دەکردەوە نەتوانم وەك پێویست بە کوردی قسانیان لەگەڵدا بکەم. ناچار لە تەك قوتابیانی تورکماندا لە پیریادی و موسەڵا، چوومە بەر خوێندنی عەرەبی. خوێندنی سەرەتاییم لە کووت، ناوەندی و ئامادەییم لە کەرکووك تەواو کردووە. لە شاری کەرکووك بە کولتوور، کەلەپوور، فۆلکلۆر و زمانی کوردی ئاشنا بوومەوە. کتێبخانەکانی ئەوسای کەرکووك، (ئاسۆ، هەندرێن، گەل، دارا، ئەمین، عەسری و تەرەقی) بۆ من بوون بە چاوگی کتێب و چاپەمەنی. بەهۆی ئەوانەوە رۆژانە بە دیتن و کرینی رۆژنامەی کوردی و عەرەبی شاد دەبووم. لە رێی خوێندنەوەی چاپەمەنی و کتێبەوە فێری کوردی بوومەوە. لە ساڵی ۱۹۸۳دا لە کەرکووك لە کار دەرکرام، لە ساڵی ۱۹۸٥دا رووم کردە هەولێر و دووبارە بە فەرمانبەر دامەزرامەوە. لە هەولێردا لە ساڵانی (۱۹۹٤ تا ۱۹۹۷) سێ کتێبخانەم بە ناوی (کرماشان، دڵێر، هونەر) کردەوە، بۆ ئەمی دواییان مۆڵەتی وەزارەتی رۆشنبیریشیم وەرگرت. (پەیمانگای تەکنیکیی کەرخ)م لە ساڵی ۱۹۸۰ لە بەغدا تەواو کردووە. بە سێ جار لە ساڵانی (۱۹۸۰ - ۱۹۸۳) و (۱۹۸٦ - ۱۹۸۷) و (۱۹۹۰ - ۱۹۹۱) بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە سوپای عێراقدا سەرباز بووم. لە ساڵی ۱۹۸۳دا بە فەرمانبەر لە کەرکووك دامەزرام. دوای ٤۸ رۆژ بەعس لە کار دەریکردم. لە ساڵی ۱۹۷۳ـەوە، کە قوتابیی دووی ناوەندی بووم، دەستم بۆ قەڵەم بردووە و خۆم لە دنیا نووسین داوە.

سەرەتا بە کۆکردنەوەی هەندێك بابەتی فۆلکلۆر (شیعر و چیرۆك) لە زاری باپیرمەوە دەستم پێکرد. زۆر شەیدای ئەوە بووم کوردییەکی باش و پاراو بزانم. لە ناخمدا ململانێیەکی سەخت بۆ ساغکردنەوەی ناسنامەکەم وەك مرۆڤێك لە ئارادا بوو، بە تایبەتی کە بە منداڵی بە فراوانی کەوتبوومە بن کاریگەریی کولتووری عەرەبەوە. حەزم دەکرد هەر شتێکی بە کوردی دەنووسرێت و چاپ دەکرێت، هەم بێت و ئەرشیفی بکەم. قوتابیی دووی ناوەندی بووم لە ساڵی ١٩٧٤دا، چوومە کتێبخانەی ئاسۆ بۆ کرینی کتێبی (شەرەفنامە)، کە رۆژانەی دوو مانگی خۆم بۆ کۆ کردبووەوە. لەبەر بچووکیی تەمەنم، جەبار ئاسۆ (خاوەنی کتێبخانەکە) سەرەتا دڵی نەهات ئەو کتێبە بەنرخەم پێ بفرۆشێت. (نرخی "شەرەفنامە" یەك دینار و نیو بوو، رۆژانەکەشم "٢٥" فلس بوو). دوای پێداگرییەکی زۆر، جەبار ئاسۆ قەناعەت دێنێ کتێبەکەم پێ بفرۆشێ. دوای تێپەڕبوونی ٢٠ ساڵ بەسەر کرینی ئەو کتێبە، وەك زۆر لە نووسەرانی دی، بۆ نان و خۆراك ئەو (شەرەفنامە)یەم بە ٢٠٠ دینار فرۆشتە کوردێکی رۆژهەڵات. نەك هەر شەرەفنامە، بەڵکوو زۆر کتێبی نێو ئەم کتێبخانەیە زیاتر لە جارێك فرۆشراون، پاشان لەگەڵ باش بوونی باری دارایی کردراونەتەوە. لە ساڵی ١٩٨٣دا بە پشتیوانیی باوکم و دایکم (یەکەمیان ٨٠٠ دینار و دووەمیان ٢٠٠ دیناری دامێ) یەکەمین کتێبی خۆم (دوای دەسکاری کردن و بە هەزار ناڵی عەلی تا لە دەزگای سانسۆری عێراق دەرچوو) لە بەغدا چاپ کرد. لە ساڵی ١٩٨٤دا یەکەمین وتارم کە رەخنەی شێوەکاری بوو، لە ژمارە ٢١ی گۆڤاری (کاروان)دا بڵاوبووەتەوە. لە نزیکەی (٢٠) گۆڤار و رۆژنامەی کوردی و عەرەبی وەك (پەیامنێر، بەرپرسی لاپەڕە، بەرپرسی دۆسێ، ئەندامی دەستەی نووسەران، بەڕێوەبەری نووسین، پێداچوونەوەی زمان و رێنووس و خاڵبەندی، وەرگێر، جێگری سەرنووسەر، سەرنووسەر و هاوسەرنووسەر) کارم کردووە. لە نزیکەی ١٠٠ رۆژنامە و گۆڤار و ماڵپەڕدا، بە دەیان هەزار بابەتی بە کوردی و عەرەبیم بڵاوکردووەتەوە. گۆڤار و رۆژنامە هەبووە (بۆ نموونە گۆڤاری "کشتوکاڵ"، گۆڤاری "الصوت الآخر"، رۆژنامەی "باسەرە" و گۆڤاری "وەبەرهێنانی پایتەخت"، هەروەها رۆژنامەی "صوت الاکراد")، هەندێك لە ژمارەکانیان چارەك تا سێیەکی لاپەڕەکانی بە نووسین و بابەتی خۆم پرکردووەتەوە. لە نووسینی نێو رۆژنامەگەریی کوردی و ئەو کتێب و وتارانەی وەریگێڕاوم، بە هەزاران پەیڤ و زاراوەی نوێم خستووەتە نێو زمانی کوردییەوە. لە ساڵی ١٩٧٣ەوە بەردەوام رۆژنامە و گۆڤار و کتێب و چاپەمەنی دەخوێنمەوە، بەم دواییەش رۆژانە تەماشای چەند ماڵپەڕێکیش دەکەم، رۆژ نییە دەیان لاپەرە نەنووسم یان وەرنەگێڕم یان ئامادە نەکەم. تا ئێستا ٢١ کتێب و نامیلکەم چاپ کردووە، چەند دەستنووسێکم (بە نووسین و وەرگێڕان) ئامادەن بۆ چاپ. بە زیاتر لە ٢٠ نازناو، هەروەها بێ ناو و بە ناوی خەڵکی دیکە، بە ناوی گۆڤار و رۆژنامەوە، بابەتم بڵاوکردووەتەوە.

*** کتێب و نامیلکەکان:**

ئەمانەی دادێ، ناوی ئەو کتێب و نامیلکانەیە، کە چاپم کردووەن:

١-کورە کەچەڵە و چەند پارچە شیعری فۆلکلۆری، فۆلکلۆر، چاپخانەی ئەلحەوادس، بەغدا، ١٩٨٣.

٢-مافەکانی مرۆڤ، وەرگێڕان، چاپخانەی ئەلزەمان، بەغدا، ١٩٩١.

٣-حەوت هاوکێشە، فەلسەفە، کۆپی، هەولێر، ١٩٩٢.

٤-سام و جەمشیر، فۆلکلۆر، کۆمپیوتەری بەمۆ، هەولێر، ١٩٩٩.

٥-رێبازە هاوچەرخەکانی فەلسەفە، وەرگێڕان، دهۆك، ٢٠٠١.

٦-رۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، وەرگێڕان، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٧-نیگار بۆ قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، وەرگێڕان، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤ و ٢٠٠٦.

٨-نیگار بۆ قۆناغی سەرەتایی، وەرگێڕان، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧.

٩-ستاتیکا و شاکاری کوردی- کتێبی یەکەم، رەخنەی شێوەکاری، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٠-سەربردەی فەلسەفە- بەرگی یەکەم، وەرگێڕان، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٧.

١١-چاندن لە ژووری پلاستیك، وەرگێڕان، چاپخانەی کشتوکاڵ، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٢-هونەر و سایکۆلۆژیای منداڵ، وەرگێڕان، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٣-بۆچی لە ئەڵمانیا دروستکراوە، وەرگێڕان، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٤-لە بەندیخانەوە بۆ تەختی سەرۆکایەتی، وەرگێڕان، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٥-ستاتیکا و شاکاری کوردی- کتێبی دووەم، رەخنەی شێوەکاری، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٦-گەشتێك بۆ شاری نەشرەف، گەشت، چاپخانەی نەشرەف، ٢٠٠٨.

١٧-بەر لە خەزان، رەخنەی شێوەکاری، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٨-دار و دەوەن لە کوردستاندا، وەرگێڕان، چاپخانەی کشتوکاڵ، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٩-فیکر و فەلسەفە- دەقی جیهانی، وەرگێڕان، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١١.

٢٠-رێبەری هەولێر، گەشتیاری، نووسین و وەرگێڕان و ئامادەکردن (بە زمانی عەرەبی)، چاپی لوبنان، ٢٠١١.

٢١-فیکر و فەلسەفە- کۆمەڵە تێکستێکی فەلسەفەی هاوچەرخ، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٣.

*** ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کارم تێدا کردوون:**

-بەرپرسی لاپەڕەی هەواڵەکانی ناوخۆی ڕۆژنامەی برایەتی بووم (١٩٩٣-٢٠٠٣).

-ئەندامی ئەنجومەنی نووسەرانی گۆڤاری (هاواری کەرکووك) بووم.

-بەرپرسی لاپەڕەکانی هونەر و ئەندامی دەستەی نووسەرانی هەفتەنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر) بووم.

-ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (مئوية الجواهري) بووم.

-ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (خطاب الأخوة) بووم.

-ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (بزاو) بووم، بابەتیشم لە (کرمانجیی لاتینی)یەوە دەگۆڕییە (کوردیی سۆرانی)، بە تایبەت وتارەکانی فەیسەڵ داغلی سەرنووسەری (باس نووچە) کە لە ئەستەنبوول دەردەچێت.

-بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی (باسەرە) بووم.

-سەرۆکی لیژنەی دامەزراندنی لقی کەرکووکی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بووم.

-بۆ دوو جار بووم بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (باسەرە).

-لە دوو ژمارەدا جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (نەوشەفەق) بووم.

-بەرپرسی نووسینگەی (التآخي) بووم لە کەرکووك.

-پەیامنێری ماڵپەری (نقاش) بووم لە هەولێر و کەرکووك، ئەو ماڵپەرە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبییە، لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیاوە بەڕێوە دەچێت.

-بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (کشتوکاڵ) بووم.

-ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (صوت الآخر)م.

-لە ژمارە (٧)ـەوە تا ژمارە (٢٠٠) وەك وەرگێر لە ڕۆژنامەی (ڕووداو)دا کارم کردووە.

-لە ژمارە یەکەوە تا ئێستا وەك وەرگێڕ لە ڕۆژنامەی (باس) دا کار دەکەم.

-جگە لە نووسینی چەندین بابەت، بە ناوی خۆی و بە نازناوی جیاجیا، بۆ هەر ژمارەیەکی گۆڤارەکە، لە ڕووی زمان و ڕێنووس و خاڵبەندییەوە، بە سەرجەم بابەتەکانی گۆڤاری (سیروان)دا دەچمەوە.

-سەرنووسەری ڕۆژنامەی (صوت الأكراد: دەنگی کورد) بووم لە ژمارە ٤٥٥ـەوە تا ژمارە ٤٨٩ کە دوایین ژمارەی ڕۆژنامەکە بوو، ئەم ڕۆژنامەیە ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کورد لە سووریا- ئەلپارتی بووم.

-ئێستا وەك هاوسەرنووسەری ڕۆژنامەی (کوردستان) م، کە مەکتەبی ناوەندیی ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان- سووریا دەری دەکات.

-سەرنووسەری گۆڤاری (وەبەرهێنانی پایتەخت)م. ئەم وەرزە گۆڤارە دوای دەرچوونی دوو ژمارە، بە هۆی قەیرانی دارایی هەرێمەوە وەستا.

*** ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی بۆ دیالۆگ:**

ئەم ناوەندە لە سەرەتادا بەناونیشانی ناوەندی ئەندێشە و قاوەخانەی مێخەك کرایەوە لە ڕۆژ ٢٨ی ئابی ساڵی ٢٠١٦ لە شەقامی کۆماری بەرامبەر چێشتخانەی عەبدوڵڵا. لەلایەن (زاهیر شوکر)ەوە کرایەوە.

ئەم ناوەندە پێکهاتووە لەم بەشانەی خوارەوە:

١- بوونی کتێبخانەیەکی گەورە نزیکەی ١٢هەزار کتێبی جۆراوجۆری تێدایە بە زمانەکانی عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی و تورکی.

٢- هۆڵی کۆڕ و دیالۆگ.

٣- هۆڵی قاوەخانە.

٤- هۆڵی خولی فێربوونی زمان و مۆسیقا

٥- گەلەری وێنەکێشان.

٦- گەلەری پێشانگا.

*** کتێبخانەکانی (تێگرتنی بەرگ - جزوبەند)**

*** کتێبخانەی (مکتب الفن الحديث):**

ئەم کتێبخانەیە خاوەنەکەی یەکێکی ئەرمەنی بوو بە ناوی (سلێوە) بە ناوی (مکتب الفن الحديث)، لە سەرەتادا شوێنی لە گەڕەکی (شاترلو-شاتەری) بوو لە نزیك مزگەوتی ئاوچییەکان بەڵام لە دوایدا شوێنەکەی گوازرایەوە بۆ نزیك شەقامی سینەما (حەمرا)، هەر لە (١٩٦٠)ەوە کاری تێگرتنی بەرگی کردووە کە تاوەکو حەفتاکان بەردوام بوو.

*** کتێبخانەی (سەلاح):**

هەر لە شەستەکانەوە هەبووەو تا ئەم ساڵانەی دوای مابوو، بەڵام ئێستا کاری نەماوە.

*** کتێبخانەی (ئەهرام):**

هەر لە شەستەکانەوە هەبوو، کە خاوەنی بە ناوی (یەڵماز عوبێد) بووە.

*** کتێبخانەی (فارابی):**

لە حەفتاکانەوە کراوەتەوە کە خاوەنی (سوبحی حوسێن عومەر) بوو، بەڵام ئێستا ماوە لە شەقامی ئەتڵەس بەڵام ڕۆژنامەو گۆڤار دەفرۆشێت.

*** کتێبخانەی (سەلاح):**

لە حەفتاکانەوە کاری کردووە کە کوڕەکەشی (عەزیز) لەگەڵیدا کاری تێگرتنی بەرگیان کردووە.

*** کتێبخانەی (بدائع الفن):**

شوێنی ئێستای لە نێو بازاری هەراجخانەیە لە شەقامی ئەتڵەس، خاوەنەکەی (حاجی جەودەت عەبدولواحید عەبدولمەجید)ەو هەر لە شەستەکانەوە تاوەکو ئێستا بەردەوامە.



بەرگتێگری دارولبەدائیع

*** کتێبخانەی (سەمیر):**
خاوەنەکەی (سەمیر نورەدینە) لە نەوەتەکانەوە بەردەوامە تاکو ئێستاکە.
**سەرچاوەکان:**
* (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، ل ١٣٤.
* گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٩٢)، ساڵی ١٩٩٦، ل ٢٤، دکتۆر زەنون پیریادی، (عومەر بێ کەس و چاپەمەنی کوردی لەشاری کەرکوك).
* گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٠٥) تشرینی یەکەمی ١٩٩٧، ل١٨، عەبدوڵلا عەبدولڕەحمان زەنگنە، (منیش ئەوەندەی لێ ئەزانم).
* هەروەها بڕوانەی گۆڤاری (سومەر) بە زمانی تورکمانی و عەرەبی دەردەچێت.
* (خزائن الكتب القديمة في العراق)، گۆرگیس عەواد، چاپخانەی (المعارف)، ١٩٤٨.
* (كركوك وهويتها القومية والثقافية)، ماهیر نەقیب، وەرگێرانی: حەبیب ئەلهورمزی، ٢٠٠٨.
* (شهداء الحزب.. شهداء الوطن، شهداء الحزب الشيوعي العراقي ١٩٣٤-١٩٦٣)، ٢٠١٢.

*** مێژووی کەناڵە ئاسمانیو تەلەفیزیۆنە ناوخۆییەکانی کەرکوك:**

**١. مێژووی تەلەفزیۆنی کەرکوك**

**هاشم جەباری**

لە ساڵیادی شۆڕشی (١٤)ی تەمموز، ڕۆژی (١٥)ی تەمموزی ساڵی (١٩٦١) بەردی بناغەی تەلەفزیۆنی کەرکوك دانرا و دوای نزیکەی شەش ساڵ لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٧) لەلایەن سەرۆك وەزیرانی عێراقی ئەو سەردەمە (تاهیر یەحیا)کرایەوە، هۆکاری دواخستنی کردنەوەی تەلەفزیۆنی کەرکوك لە ساڵی (١٩٦١) وە تا(١٩٦٧)، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی عێراقو کوردستان وهەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول.

لە سەرەتاوە بەرنامەکان لە بەغداوە تۆمار دەکرا، ڕۆژی دواتر بە ئۆتۆمبێل دەهاتە تەلەفزیۆنی کەرکوكو پەخش دەکرا، چونکە لە کەرکوك کادری هونەری پێویست وستودێوو ئامێرەکان لە ئاست تواناو شارەزاییو ئامێرەکانی بەغدا نەبوو، بۆیە تا ماوەیەکی زۆر بەرنامەکان، لە بەغداوە دەهات، هەواڵەکانیش لە ڕێگەی ئامێرێکەوە دەهات پێیان دەوت (بەرق تابع)، بۆ خوێندنەوەی هەواڵەکان، سەرەتا ڕۆژەکانی هەفتە دابەشدە کرا بە سەر (ڕوشدی عەبدولساحیبو نیهاد نەجیبو سوعاد هورمزی)، ئەمانە بە نۆرە لە بەغداوە دەهاتن بۆ کەرکوك، بۆخوێندنەوەی هەواڵەکان.

یەکەم بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی کەرکوك عەرەب بوو، ناوی (یەحیا جەمیل حومادی) بوو، خەڵکی بەغدا بوو، لە بنەڕەتدا کەسێکی ڕاگەیاندکار نەبوو، بەڵکو مامۆستای زمانی عەرەبی بوو، لە هەڵسوکەوتو ئیدارەدانی تەلەفزیۆنەکە پیاوێکی هێمن و ڕێزدار بوو، شارەزای هەبوو لە ئەدەبی کوردی بە تایبەتی زۆر حەزی بە شیعرەکانی مامۆستا گۆران بوو.

(محەمەد ئەحمەد ڕەحیم) ئەندازیاری تەلەفزیۆن بوو، چاککردنو سیانە کردنی ئامێرەکانی لە ئەستۆ بوو، ئەندازیارێکی لێهاتوو بوو، (سدیق شێخ محەمەد) پسپۆڕو شارەزا بوو لە ئیشو کاری ڤیدیۆ، هونەرییەکانی دیکەش بریتی بوون لە (ئیسماعیل عەزیز، سالم ئەحمەد، مەناف ،شەوکەت مەعروف)، لە تورکمانیش (سەفوەت سەفانەدین، قاسم مەندان، عەلائەدین بەهادین)، ئەمانەش هەموو ئەندازیاری هونەری بوون، لە مەسیحیەکان (بەهنام ڕۆفایل، لویس گۆرگیس، تۆمابۆیا) هەرسێکیان شارەزای بواری سینەما بوون، دوو شارەزای هونەری عەرەبیشمان هەبوو لە بەغداوە هاتبوون (باسل جاسم، عەبدوڵا جارەڵا) ژنێکی عەرەبیش وەك بێژەر بە گرێبەست کاری دەکرد، ناوی هەدیل بوو، دواتر (تەحسین هورمزی)، کە تورکمان بوو، بووە بێژەری سەرەکی زمانی عەرەبی.

پێش ئەوەی من بچمە تەلەفزیۆن، کاك نامیق محەمەد لەسەر بڕیاری حیزب (باڵی مەکتەبی سیاسی) پارتی دیموکراتی کوردستان وەك بێژەرو جەبار جەباری وەك وەرگێڕو بێژەر دانرابوون، کە کاك نامیق گەڕایەوە بۆ ئیشو کاری حیزبی، لەسەر پێشنیاری شەهید جەبار جەباری، حیزب پشتیوانی لە هاشم جەباری کردو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك دەستبەکار بوو، دوا بە دوای هاشم جەباری جەباری محەمەد هەمەوەندیش بووە بێژەری کوردی.

لە سەرەتاکانی ساڵی (١٩٧٣)وە چەند ژنێك داواکاریان پێشکەش تەلەفزیۆن کرد بۆ بێژەری، ئێمەش پێویستیمان بە یەك بێژەری کوردی ژن هەبوو، سوهەیلە ئیبراهیمو نەسرین مەحمود داواکاریان پێشکەش کرد، سوهەیلە ئیبراهیم بە تاقیکردنەوەو نەسرین مەحمود بە پشتیوانی خالید دلێر وەرگیران، ساڵی (١٩٧٥)، پەروین مەحمود خوشکی نەسرین مەحمود بە بێژەر وەرگیرا، پەروین خان جگە لەوەی بە تەمەن لە بێژەرەکانی دیکە منالتر بوو، بەشێوەش لە وەکانی تر جوانتر بوو، شێوەی پەروین خان زۆر گونجاو بوو بۆ شاشەی تەلەفزیۆن ودواتریش بێژەرێکی شارەزاو لێهاتووی لێ دەرچوو، بۆ بێژەری تورکمانیش مەولود تەها قایەچی وعەبدوڵا جەعفەر داقوقلی وەرگیرا، مەولود تەها مامۆستایی زمانی عەرەبی بوو، بە گرێبەست وەرگیرا، هەم بێژەر بوو، ئەمیش وەرگیرا، بۆ بەشی تەنسیقیش کچێکی تورکمان بە ناوی فەیحا زەینولعابیدین وەرگیرا، دواتریش بووە بێژەری هەواڵی تورکمانی، تەلەفزیۆن جۆرێك فراوانی بەخۆیەوە بینی، لەیلا محەمەد نەورۆز ژنێکی کورد بوو، بووە بێژەری زمانی عەرەبی، ژنێکی دیکەش هەواڵی عەرەبی دەخوێندەوە ناوی کەرەوان سەعید بوو، (ڕەبقە خامس قەندۆ)یش هەواڵی سریانیشی دەخوێندەوە.

تا ئەم قۆناغەش، پەخشی تەلەفزیۆن ڕەش وسپی بوو، زۆربەی دراماکان درامای میسری بوو، ناو بەناویش درامای عێراقی وشانۆگەری پەخش دەکرا، دراما عێراقییەکان، لە جۆری شانۆگەری (دەبە خانە)و (ایدك بالدهن)و (النخلة والجیران) وتەمسیلی (تحت موس الحلاق) بوو، درامای کوردی لە دوای بەیان نامەی (١١)ی ئازار دەستی پێکرد، تەلەفزیۆنی کەرکوك بووە مایەی گەشە کردنی هونەرو ئەدەبو ڕووناکبیری کوردی لە کوردستان بەگشتی وکەرکوك بەتایبەتی.

یەکێك لەو بێژەرە ژنانەی کە ماوەیەکی کورت لە تەلەفزیۆنی کەرکوك وەرگیرا، ژنە بێژەری بە توانا (سامیە ئەترەش) بوو، چوونییەتی وەرگرتنی بەم شێوەیە بوو: ساڵی (١٩٧٣)، بارەگای تەلەفزیۆن لە سەنتەری شارەوە دوور بوو، بە ئۆتۆمبێل دەچووین بۆ تەلەفزیۆن، لە ڕێگە بەو گەرمایە ژنێکمان بینی، چونکە داوای بێژەرمان کرد بوو، زانیم ئەو ژنە بۆ تەلەفزیۆن دەچێت، وەستاینو پرسیارمان لێکرد، لە وەڵامدا وتی دەچم داواکاری بێژەری پێشکەش بە تەلەفزیۆن دەکەم، ئیتر لە گەڵ خۆمان هەڵمان گرت، دوای چاوپێکەوتنو تاقیکردنەوە وەرگیرا. سامیە ئەترەش، ژنێکی بە سەلیقەو بە توانا بوو، دوای وەرگرتنی زۆر لە کەرکوك نەمایەوە، چوو بۆ

بەغدا، ماوەیەكیش لە بەغدا بوو، دواتر سەفەری هەندەرانی كردو لە لەندەن خۆی گرتەوە، ماویەكی زۆر لە رادیۆی (بی.بی.سی) بێژەر بوو، هەواڵەكانی پێشكەش دەكردو لە هەمان كاتیشدا بەشداری لە بەرنامە سەركەوتووەكەی (ندوة المستمعین) دەكرد.

(محەمەد سەعید سەحاف) بەڕێوەبەری گشتی ئێزگەو تەلەفزیۆنی عێراق بوو، لە سەر بڕیاری ئەو خولێكی سێ مانگی كرایەوە، لە تەلەفزیۆنی كەركوك (نەسرینو سوهەیلەو كەرەوانو لەیلاو ڕوقەییە) بەشدارییان تێداكرد.

لە سەرەتاوە ڕۆژانە (١٥) دەقیقە بۆ پەخشی كوردی تەرخان كرابوو كە بریتی بوو لە هەواڵەكانو گۆرانییەكی كوردی، بۆ توركمانیش لە سەرەتاوە (١٠) دەقیقە تەرخان كرا، ساڵی (١٩٧٠) پەخشی كوردی بووە (٢٠) دەقیقە تاوەكو ساڵی (١٩٧٢)، هیچ بەرنامەیەك یان درامایەك لە كەركوك تۆمار نەكرابوو، لە ساڵی (١٩٧٢)دا، بۆ یەكەم جار لە تەلەفزیۆنی كەركوك، درامای (بەهاری دڕاو)و درامای (مەرەزە) لە كەركوك تۆمار كرا، دواتریش درامای (ژاڵە) بە كامێرای تەلەفزیۆنی كەركوك لە سلێمانی تۆمار كرا.

ساڵی (١٩٧٣)، ئەندامێكی لقی حیزبی بەعس لە كەركوك، بە ناوی (رافع كوبەیسی) كرایە بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی كەركوك و، ماوەی پەخشی كوردی بۆ (٤٠) دەقیقە لە ڕۆژێكدا زیاد كرد.

لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٤) گۆڕانكارییەكی چوونایەتی گەورە لە پەخشی كوردی تەلەفزیۆنی كوردی ڕوویدا، لەم مێژووەدا، بەشی كوردی جیابووەوەو بووە كەناڵێكی سەربەخۆو بەرنامەكانی بە شێوەیەكی فراوان زیادی كرد، ڕۆژانە پەخشی كوردی لە كات ژمێر (٦)ی ئێوارەوە دەستی دەكرد بە وەشاندن تاوەكو كاتژمێر (١٢)ی شەو، لە تەلەفزیۆنی گشتی كەركوكیش پەخشی توركمانی كرایە (٣٠) دەقیقەو سریانیش (١٥)دەقیقە.

پێش جیابوونەوەی بەشی كوردی، واتا پێش (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٤) ئەم بەرنامانە هەبوون: (یەكێتی ئەدیبو نووسەرانی كەركوك)، پێشكەشكردنی مستەفا سالح كەریم، كە كاك مستەفا وازی هێنا، ماوەیەكیش جیهان عومەر پێشكەشی دەكرد، بەرنامەكە چاوپێكەوتن بوو لەگەڵ ئەدیبو نووسەران، لەو ماوەیەدا چاوپێكەوتنی لەگەڵ ئەحمەد هەردیو (ع.ع. شەونم)و هەوریو بەشێكی تری ئەدیبو نووسەران ئەنجامدا، بەشێكی دیكەی بەرنامەكە قسە كردن بوو لە سەر ڕووناكبیرانی كۆچ كردووە، بەرنامەكانی دیكە لەو سەردەمەدا سیاسی بوون وەك: (عێراق لە هەفتەیەكدا)، (جیهان لە هەفتەیەكدا)، (لە بیرەوەری شۆڕشەوە)، (بەرنامەی (١٠)دە دەقیقە).

لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٤)وە بەرنامەكان بەم شێوەیە گەشەی كردو ئەم بەرنامانە زیادی كرد: (ئاوێنەی هونەر، پێشكەشكردنی نەسرین مەحمود، گۆرانی داواكراو (هەمەرەنگ) پێشكەشكردنی پەروین مەحمود، بەرنامەی بەهرەوەران پێشكەشكردنی شەوكەت رەشید. لە بەرنامەی بەهرەوەران یەكێكیان لێ پەیدا دەبێت، دەنگی زۆر ناخۆش دەبێت، خوالێخۆشبو شەوكەت رەشید بێزار دەكات، شەوكەت رەشید داوای لێدەكات ستافی بەرنامەكە لە قەرەهەنجیر بانگهێشت دەكات و، لەوێ دەنگی تاقی دەكەنەوە، ئەمیش دوو هەفتە لە سەر یەك بانگهێشتیان دەكات، بەڵام شەوكەت رەشید هەر دوو جارەكە لەسەر گردێكی قەرەهەنجیر دای ئەنێو پێی دەڵێ: وەك كەر بزەڕڕە! دوای دوو جار بانگهێشت كابرا تێدەگات كە وەرناگیرێ وازدێنێ، بەرنامەكانی دیكە بریتی بوو لە بەرنامەی پەیامی هونەر پێشكەشكردنی كەمال رەئوف.

لە یادی نەورۆزدا هاشم جەباری ساڵانە بە جلوبەرگی كوردییەوە بەرنامەیەكی یەك سەعاتی پێشكەش دەكرد، بەرنامەی (هونەرمەندی هەفتە) خاتوو دڵپاك تاهیر پێشكەشی دەكرد، بەرنامەی (هونەرو ژیان) ئامادەكردنی ناسر حەسەن، بەرنامەی (وەرزشو لاوان) پێشكەشكردی شێخ ستار عەبدوڵا، بەرنامەیەكی دیكەی هونەری هەبوو هاشم عەلی مەندی پێشكەشی دەكرد، بەرنامەی تەندروستیو ژیان پێشكەشكردنی د. نافع ئاكرێی، بەرنامەی رەنگاورەنگ ئامادەكردنی هاشم جەباریو پێشكەشكردنی پەروین مەحمود بوو، بەرنامەی (كەلەپور) پێشكەشكردنی ئەسعەد عەدۆ، بەرنامەی ڕۆژنامەگەری كوردی پێشكەشكردنی شێرزاد عەبدولرەحمان، عەبدولوەهاب تاڵەبانیش بەرنامەیەكی ئەدەبی پێشكەش دەكرد، محەمەد عەبدولرەحمان زەنگنە بەرنامەی دیداری ئەدەبی پێشكەش دەكرد، عومەر ئیبراهیم عەزیز بەرنامەیەكی زمانەوانی پێشكەش دەكرد، محەمەد بەكر بەرنامەی شیعرستانی پێشكەش دەكرد، سابیر رەفیق بەرنامەیەكی زانستیو مەلا شەوكەت بەرنامەی ئاینی پێشكەش دەكرد، شیرین عەباس بەرنامەی ئافرەتانی پێشكەش دەكرد، ئەم بەرنامەیە لە بەغداوە تۆمار دەكرا، مەحمود عەلی بەرنامەیەكی زانستیو زانیاری پێشكەش دەكرد، كەریم بەدەل رەفۆ بەرنامەیەكی ئەدەبی بە زمانی كرمانجی ژووروو پێشكەش دەكرد، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك بەرنامەی یەكێتی ئەدیبو نوسەران وەستا بە ماوەیەك سەر لە نوێ بەرنامەكە لە لایەن دڵشاد مەریوانییەوە پێشكەش دەكرا، بەرنامەی ئافرەتانیش شیرین عەباس بوو دواتر وازی لە پێشكەشكردنی هێناو پەخشان مەحمودو لە بەغداوە تۆمار دەكرا، عومەر ئیسماعیل بەرنامەیەكی ئەدەبی پێشكەش دەكرد، بەرنامەیەكی ڕۆشنبیریش لە لایەن محەمەد هەمەوەندییەوە پێشكەش دەكرا،مامۆستا ناسر حەسەنیش بەرنامەی لادێی نوێ پێشكەش دەكرد.

بەرنامەكانی تەلەفزیۆن، زۆربەی بەرنامەی ڕووناكبیری گشتیو ئەدەبی بوو، ئەم بەرنامانە ڕۆڵێكی ئێجگار گرنگی هەبوو لە گەشەكردنی ڕووناكبیری كوردیو گرێدانی ڕووناكبیرانی شارەكانی كوردستان بە یەكترییەوە، تەلەفزیۆنی كەركوك بووە وێستگەی بە یەك گەیشتنی نووسەرانو ڕووناكبیرانو هونەرمەندانی كوردستان، كەركوك بووە ناوەندێكی گەورەی پەرەپێدانو گەشەكردنی كاروانی ڕووناكبیری لە كوردستان، لە پاڵ ئەمانەشدا بیری نەتەوەیی زیاتر پەرەی دەسەند، ناساندنی ڕووناكبیرانو نووسەرانو

هونەرمەندان بەشێك لە ئەرك و کارەکانی تەلەفزیۆنی کەرکوك، تەنانەت تەلەفزیۆن ڕۆڵی هەبوو لە ناو لێنانی منداڵان بە ناوی کوردییەوە، ئەم گەشەکردنانە بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك، لێرەوە بوونی تەلەفزیۆنی کوردی لە کەرکوك بووە مایەی ترس لەلای سەرانی بەعس لەم سۆنگەیەوە سەعد بەزاز بەڕێوەبەری گشتی ئێزگەو تەلەفزیۆن ساڵی(١٩٨٩)، سەردانی تەلەفزیۆنی کەرکوکی کرد، لە سەردانەکەی بێ سێ و دوو وتی: کەرکوك شارێکی عەرەبیە چۆن دەبێت تەلەفزیۆنی کوردی لە کەرکوك هەبێت! لە گەڕانەوەیدا سەعد بەزاز بۆ بەغدا بڕیاری گواستنەوەی تەلەفزیۆنی کوردی کەرکوکی دەرکرد بۆ موسڵ.

مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩)، بەشی کوردی بەرنامەکانی لە موسڵەوە دەستی بەوەشاندن کرد، زۆربەی کارمەندانی کەرکوکیان بە ئیفاد برد بۆ موسڵ، ئەوانەی لە کەرکوکەوە ڕۆیشتین بۆ موسڵ بریتی بوون لە: (هاشم جەباری، حەبیب یوسف بەکتاش، ئەحمەد فاتیح).

لە بێژەرەکانی تەلەفزیۆنی جگە لە هاشم جەباری، شەفیق ڕەفیق، سەباح موسا، سوهام محەمەد، بێژەری تورکمانی سەوسەن بەکر، ئەمیرە زەینەل، عەبدلعزیز سەمین بەیاتی، ڕەجا قەمبەر، سائرە فەرەج بێژەری سریانی بوون، لە موسڵ بەدەل ڕەفۆ وەك بێژەری بادینی لە تەلەفزیۆن وەرگیرا.

ئەو بەرنامانەی لە موسڵەوە پێشکەش دەکران، ڕۆژنامەی ئوتۆنۆمی کە هاشم جەباری ئەم بەرنامەیە پێشکەش دەکرد، بەرنامەیەکی هەفتانە بوو، چالاکییەکانی ناوچەی ئوتۆنۆمی دەخستە ڕوو، بەدەل ڕەفۆ مزووری بەرنامەیەکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی بە زاراوەی بادینی پێشکەش دەکرد، بەرنامەیەکی تری ڕۆشنبیری کوردی هەبوو بە زاراوەی بادینی ڕەشید فەندی پێشکەشی دەکرد، دکتۆر یاسین بەرنامەیەکی ئەدەبی پێشکەش دەکرد، بەرنامە تورکمانییەکان جگە لە هەواڵەکان کە سەوسەن بێژەری تورکمانی، بەرنامەی گۆرانی داواکراویشی بە زمانی تورکمانی پێشکەش دەکرد.

ساڵی (١٩٩١)، فرۆکەکانی ئەمریکا بۆردومانی تەلەفزیۆنیان کرد، ئەوکات بەشی کوردیش لە موسڵ بوو، بۆردومانەکە بینایەی تەلەفزیۆنی تەفروتونا کرد، ڕۆژێك پێش بۆردومانەکە، هەموو کەلوپەلەکانی تەلەفزیۆنەکەیان گواستبووە بۆ مۆزەخانەی موسڵ، دوای بۆردومانەکەی تەلەفزیۆن، جارێکی تر گەڕانەوە بۆ کەرکوك، سەر لە نوێ لە کەرکوکەوە دەستیان بە پەخش کردەوە.

لە کەرکوك هاشم جەباری هەفتانە بەرنامەیەکی بەناوی (ئەرشیفی تەلەفزیۆنی) ئامادە دەکردو سەمیرە مەحمود پێشکەشی دەکرد، ئەم بەرنامەیە شەوانی هەینی لە جیاتی فلیمی شەو پێشکەش دەکرا، بەرنامەیەکی تر کە پێشکەش دەکرا بەرنامەی ڕوانگەی ئەدەب بوو، ئەم بەرنامەیە هۆشیار ئەحمەد ئەسوەد پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی هونەرمەندی هەفتە، ئەم بەرنامەیە ماوەکەی ساعاتێك بوو هەڵۆی هاشم جەباری پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی کەلەپوری کوردەواری، هەردەویل کاکەیی پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی ڕووناکی قورئان شێخ محەمەد فاتیح پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی هونەری مۆسیقا، زیاد عەلی بەرزنجی پێشکەشی دەکرد.

بەرنامەی منالان، چەندین بەرنامەی جۆراوجۆری منالان هەبوو، لەوانە (بەرنامەی چیرۆکی هەفتە، پێشکەشکردنی هەڵۆ هاشم جەباری، بەرنامەی تاقیکردنەوەی زانستی بۆ منالان پێشکەش کردنی هەڵۆ هاشم جەباری، بەرنامەی جیهانی منالان ئامادەکردنی ڕەزا شوان پێشکەشکردنی نویلەو هەڵۆو کچەکەی ڕەزا شوان ، بەرنامەی جگەر گۆشەکان، محەمەد ڕەحیم ڕەمەزان پێشکەشی دەکرد، ئەم بەرنامەیە لە سلێمانی و دەوروبەری تۆمار دەکرا، بەرنامەی کۆڵکە زێرینە، ئەم بەرنامەیە نەجات کاك ڕەسوڵ پێشکەشی دەکرد، ئەم بەرنامەیەش لە هەولێر تۆمار دەکرا، دوای ئەوەدەکان هەمان بەرنامە فەرید زەنگنە پێشکەشی دەکرد. ئەم بەرنامانە جگە لەلایەنە ڕووناکبیریەکەی ڕۆڵێکی ئیجگار گرنگیشی هەبوو لە گەشەکردنی زمانی کوردی.

بەرنامە تورکمانییەکان بە درێژای ساڵانی تەلەفزیۆنی کەرکوك بریتی بوو لە (چاوپێکەوتنی هونەرمەندان، پێشکەش کردنی ڕەزا قەمبەر، بەرنامەی گۆڤاری ئەدەب، پێشکەش کردنی عەبدولعزیز سەمین بەیاتی، بەرنامەی وەرزش، پێشکەش کردنی شەمسەدین گۆزەچی، بەرنامەیەکی ئەدەبی لە لایەن فەوزی ئەکرەمەوە پێشکەش دەکرا، بەرنامەیەك تایبەت بە مەقام، ئەم بەرنامەیە هاشم زەینەل پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی ئافرەتان، فریال عیزەت پێشکەشی دەکرد، فاروق فایق بەرنامەیەکی ئەدەبی پێشکەش دەکرد بە ناوی ئەدەبیات، بەرنامەی ڕووداوی سەیر، پێشکەشکردنی عەبدولعەزیز سەلیم، عێراق لانەکەی شارستانییەتە عەبدولعزیز سەلیم پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی کشتوکاڵ، ئەم بەرنامەیە عەبدولواحید ئەحمەد پێشکەشی دەکرد، شێخ بورهان حوسامەدین بەرنامەیەکی ئایینی پێشکەش دەکرد، گۆرانی داوا کراو، سەوسەن بەکر پێشکەشی دەکرد، ئەحمەد کەرکوکلی بەرنامەیەکی ئەدەبی پێشکەش دەکرد، بەرنامەی چیرۆکی هەفتە، ئەم بەرنامەیە گوڵزار عەبدولعەزیز پێشکەشی دەکرد، بەرنامەی چوجق باخچەسی، ئەم بەرنامەیە تایبەت بوو بە منالان، ئەم بەرنامەیە حوسێن عەلی غالب و ماوەیەکیش شەنگوڵ حەسیب وسەوسەن بەکر پێشکەشی دەکرد.

لە تەلەفزیۆنی کوردی ڕۆژانە (١٥) دەقیقە پەخشی عەرەبی هەبوو، بەرنامەیەکی هاتوچۆیان هەبوو، نەقیب سەباح قرە ئالتون پێشکەشی دەکرد، خالیدە عەبدولاش کورتەیەك لە چالاکییەکانی کەرکوکی پێشکەش دەکرد هەفتانە یەك بەرنامەی سریانیش هەبوو، پیشکەشکارەکەی ناوی خنینیا بوو.

ساڵی (١٩٩٩)، بە ساڵی کۆتایی و ماڵئاوایی تەلەفزیۆنی کەرکوك حیساب دەکرێ، چونکە لەم ساڵەدا، بە یەکجاری تەلەفزیۆن لە کەرکوك داخراو ڕۆژانە ماوەی سەعاتێك لە بەغداوە پەخشی کوردی پێشکەش دەکرا.

تەلەفزیۆنی کەرکوك ماوەی(٣٠) ساڵ زیاتر قوتابخانەیەك بوو بۆ پێگەیاندنی دەیان هونەرمەندو ڕاگەیاندکارو کادری هونەری لە کەرکوك و کوردستان.



نامیق محەمەد
بێژەری تەلەفزیۆنی کەرکوک



جەبار جەباری
بێژەری تەلەفزیۆنی کەرکوک



جەبار جەباری

لەگەڵ مامۆستایانی قوتابخانەی سورکێوی سەرەتایی کوڕان لەشارۆچکەی (دووبز)



**هاشم جەباری**
**بێژەری تەلەفزیۆنی کەرکوك**



**محەمەد موراد هەمەوەندی**
**بێژەری تەلەفزیۆنی کەرکوك**




**جەبار جەباری**
**لە کاتی خوێندنەوەی هەواڵەکان لە تەلەفزیۆنی کەرکوك**



ئیبراهیم ئیسماعیل ئاغا بێژەری عەرەبی



ئیبراهیم عەباس ئەلحلو-بێژەری عەرەبی




وێنەی کارمەندانی تەلەفزیۆنی کەرکوک



ڤیان عەباس بێژەر



پەروین مەحموود-بێژەری کوردی



وێنەی کارمەندانی تەلەفزیۆنی کەرکوك



گۆرانبێژی تورکمانی یەلماز ئەرۆل



مەیسەر محەمەد عەلی - بێژەری عەرەبی



سەمیعە عەلی-هاشم -نەسرین مەحموود
لە تەلەفزیۆنی کەرکوک



ئیبراهیم عەباس ئەلحلو-بێژەری عەرەبی



ئیسماعیل ئەیوبی بێژەری عەرەبی



ژیان عەزیز- بێژەری کوردی



قادر مەردان
گۆرانبێژی تەلەفزیۆن



هەڵۆ هاشم جەباری
بێژەری تەلەفزیۆنی کەرکوك



ئیسماعیل دینۆ تەها گەیلان
بێژەری تەلەفزیۆن



عادل عەبدوڵلای دەرهێنەر و کەریم ئەحمەد لە بەشی دەنگ



عەلی محەمەد ڕەمەزان-عادل عەبدوڵلا
دوو دەرهێنەری تەلەفزیۆن



محەمەد ڕەزا بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن- ئەحمەد عیزەدین -زوهێر عەبدولمەسیح



محەمەد هەمەوەندی - هاشم-عەبدوڵلا داقووقی- ئیبراهیم ئیسماعیل ئاغا -لەیلا محەمەد نەوزرۆز
کۆمەڵێك بێژەر



**هاشم -هاشم عەلی مەندی، بێژەر**



**ڕوشدی عەبدولساحب -هاشم جەباری-کەمال**

تەلەفزیۆنی کەرکوك ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە گەشەکردن و بڵاوکردنەوەی گۆرانی کوردی، چونکە لە شاشەی تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە، هەموو شارو لادێکانی کوردستان ئاشنای هونەرمەندان و گۆرانی بێژان بوون.

لەو ڕۆژەوەی تەلەفزیۆنی کەرکوك کرایەوەو دەستی بە پەخشکردن کرد تا ڕۆژی داخستنی تەلەفزیۆنەکە ژمارەی ئەو گۆرانی بێژانەی لە تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە گۆرانیان تۆمارکرد گەیشتە (٥٣٦) گۆرانیبێژی کوردی، لەو ژمارەیە (٦٨) گۆرانی بێژی بادینی بوون، ئەوانیتر سۆرانی بوون، لەو ماوەیدا (٧٥٤) گۆرانی بە ڕەشوسپی تۆمار دەکرا (٩٤٤) گۆرانیش ڕەنگاوڕەنگ بوو، بێ گومان ئەمە دەسکەوتێکی گەورە بوو بۆ زیندوکردنەوەی دەیان گۆرانی فۆلکلۆری و پاراستنی دەیان گۆرانی لە فەوتان و سەرلەنۆی تۆمارکردنەوەیان.

دەسپێکی گۆرانیبێژەکان کە لە بەغداوە بۆمان دەهات و لەسەر کاسێتەکە ژمارە (١) دانراوە، گۆرانی بێژان سەلاح داودەو فایق داودەیە، ئەم دوو هونەرمەندە لە بەغدا یەکەم گۆرانی کوردییان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکرد، هونەرمەندی خوالێخۆشبوو سەلاح داودە، یەکەم هونەرمەندی کوردە گۆرانی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك بە ڕەشوسپی بۆ تۆمارکرد، دوا بە دوای سەلاح داودەش هونەمەندی گەورەی کورد عەلی مەردان زۆربەی گۆرانییەکانی بە وێنەی ڕەشوسپی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکرد، تێکرای مەقام و گۆرانییەکانی مامۆستا عەلی مەردان (١٨) مەقام و گۆرانی بە ڕەشوسپی بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکرد، بۆ سەرەتای دەستپێکردنی پەخشی تەلەفزیۆن پشتیان بە گۆرانی بێژانی ئێزگەی ڕادیۆی بەغدا دەبەست لە وانە: (قادر ئەحمەد، جەلال کۆچەر، ئەحمەد شێخاڵی، محەمەد قەدری، نەسرین شێروان (٧) گۆرانی، گوڵبەهار (١٦) گۆرانی، عایشە شان (٥) گۆرانی، تەحسین تەها (٣٤) گۆرانی، ئیبراهیم خەیات (٨) گۆرانی، عیسا بەرواری (١٥) گۆرانی، عومەر دزەیی (٩) گۆرانی، لە باخچەی زەوڕا لە بەغدا بۆی تۆمارکرا، ئەو سەردەمە عومەر دزەیی لە سەفارەتی عێراق لە نەمسا کارمەند بوو، لە ڕێگەی سەفارەتەوە محەمەد سەعید سەحاف ئاشنایەتی لە گەڵدا پەیدا کرد، بانگهێشتی کرد بۆ بەغدا، کە هات بۆ بەغدا لە باخچەی زەوڕا گۆرانی بە ڕەشوسپی پێش بەیاننامەی (١١)ی ئازار تۆمارکرد، دوای بەیاننامەی (١١)ی ئازار یەکەم گۆرانی لە سەر شانۆ تۆمارکرد، گۆرانی باخچەی پاشا بوو، هونەرمەند شەماڵ سائیب (١١) گۆرانی ڕەشوسپی و دوو گۆرانی ڕەنگاوڕەنگی بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکرد، شەماڵ سائیب برادەری سەردەمی مامۆستایی محەمەد سەعید سەحاف بوو لە خوارووی عێراق، کاتێك سەحاف کرایە بەڕێوەبەری گشتی ڕادیۆو تەلەفزیۆن، شەماڵ سائیب لە ئەمریکا بوو، سەحاف بانگهێشتی کردو بە کامێرای سینەمایی گۆرانییەکانیان بۆ شەماڵ سائیب تۆمارکرد.

مامۆستا تایر تۆفیق (١١) گۆرانی ڕەشوسپی لە بەغدا بۆ تۆمارکرا بوو، لە کەرکوکیش (٥) گۆرانی ڕەنگاوڕەنگی بۆ تۆمارکرا، محەمەد قەدری (٣٤) گۆرانی، دوانیان ڕەنگاوڕەنگ بوو، هەر هەمووی لە بەغدا تۆمار کرا، محەمەد عارف جەزراوی (١٥) گۆرانی و مەقامی هەبوو، جەمال جەلال (١٤) گۆرانی هەبوو، جەمال جەلال لە گەڵ (د. بەلقیس) بەرنامەیەکی گۆرانی وتنی هەبوو بە ناوی (نغمات من الشمال) ئەحمەد خەلیل جگە لەوەی ئاوازدانەر بوو دوو گۆرانیشی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکرد، یەکێك لە گۆرانییەکان گۆرانی (هەر بژی کوردو عەرەب رمز للنضال) عیسا بەروورای (١٥) گۆرانی هەبوو، فوئاد ئەحمەد (٣٤) گۆرانی هەبوو لە بەغداو کەرکوك تۆمارکرا بوو، سابیر عەبدولرەحمان (١٤) مەنەلۆجی هەبوو یەکێکیان کاکی شۆفیر بوو، بۆ ئەم مەنەلۆجە ئۆتۆمبێلی ڤۆلکس واگن-یان هێنایە ناو ستودیۆو مۆنۆلۆجەکەیان کرد.

شەوکەت ڕەشید، بە تەنیا بۆ خۆی تیپێکی مۆسیقای هەبوو، (٨) گۆرانی لە ئاوازی خۆی بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکرد، عەلی عەزیز (١٣) گۆرانی، مستەفا ڕەئووف (٣٤) گۆرانی، کەریم کابان (٧) گۆرانی ڕەنگاوڕەنگ، عەلی زەنگنە (١٩) گۆرانی، قادر مەردان (٩) گۆرانی، حەمە جەزا (٧) گۆرانی، حەسەن گەرمیان (٧) گۆرانی، عەباس محەمەد (٧) گۆرانی حەمە ڕەئوف کەرکوکی (٢) گۆرانی، سابیر کوردستانی (٨) گۆرانی، جگە لەم هونەرمەندانە دەیان هونەرمەندی دیکە گۆرانیان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکرد، کە بووە گەنجینەیەکی دەوڵەمەند بۆ هونەرو گۆرانی کوردی.

لە ماوەی پەخشی تەلەفزیۆنی کەرکوکدا بە درێژایی هەموو ساڵەکان لە بەغداوە بڕیاری قەدەغەکردنی (٣) گۆرانی هات، یەکەم گۆرانی کە قەدەغەکرا گۆرانی (شیرین بەهارەی) تایەر تۆفیق بوو، کە شیعرەکەی شیعری مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو، هەروەها بڵاوکردنەوەی گۆرانییەکانی هەر دوو هونەرمەند محەمەد شێخۆو محەمەد تەیب تاهیر، کە هەردووکیان دوو هونەرمەندی کوردی سوریا بوون.

جگە لە ئەو هونەرمەندانەی باسمان کرد، (٣٥) تیپی مۆسیقاو ژەنیار لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بەرهەمەکانیان تۆمارکرد، جگە لە ئاوازی گۆرانییەکان، (٨٤) پارچە مۆسیقای ڕەشوسپیان تۆمارکرد لە گەڵ (٣٩) پارچە مۆسیقای ڕەنگاوڕەنگ، تیپەکان ئەمانە بوون (تیپی مۆسیقای سلێمانی، تیپی هونەر وێژەی کوردی سلێمانی، تیپی ڕۆشنبیری کۆمەڵانی سلێمانی، تیپی مۆسیقای مەولەوی، تیپی مۆسیقای دهۆك، تیپی مۆسیقای هونەری هەولێر، تیپی مۆسیقای باواجی کوێە، تیپی مۆسیقای پاشای گەورە (ڕەواندوز) تیپی هونەرو وێژەی هەولێر، تیپی مۆسیقای تەلەفزیۆنی کەرکوك، تیپی ناوخۆیی هەبوو لە کەرکوك زیاتر بە ناوی کەسەکانەوە ناسرا بوو لە وانە (تیپی شەوکەت ڕەشید، عەلی زەنگنە، حەسەن غەریب و خالید جوانڕۆو مستەفا ڕەئووف، لە ژەنیارەکان کە پارچە مۆسیقایان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکرد (مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی (٩) پارچە مۆسیقای تۆمارکرد، یوسف باکوری بە گیتار پارچەیەك مۆسیقای تۆمارکرد، تیپی مۆسیقای سلێمانی جگە لە گۆرانییەکان (١٠)پارچە مۆسیقای تۆمارکرد.

باواجی (٢) پارچە، تیپی کەرکوك (٢) پارچە، جەمال شادان بە باڵەبان پارچەیەك مۆسیقای تۆمارکرد، دڵشاد تیپی دهۆك بە تەنها یەك پارچە مۆسیقای تۆمارکرد، وەکو تیپی دهۆکیش (٤) پارچە، تیپی هونەری هەولێر(٥)پارچە، تیپی مۆسیقای ڕادیۆی کوردی بەغدا (٥) پارچە، تیپی هونەری هەولێر (٣) پارچە، سەعید گاباری (یەك پارچە) مۆسیقای بە ئامێری ساز بە یەك دەست عەزفی دەکرد، یەکێك بوو لە پارچە مۆسیقا دەگمەنەکان.

یەکەم تیپی هەڵپەرکێ کە یەك هەڵپەرکیان بە ڕەش‌و سپی تۆمارکرد تیپی هەڵپەرکێی خەبات بوو، ئەم تیپە کۆمەڵێك گەنج بوون، هەڵپەرکێیان لە بەغدا تۆمار دەکرد، تیپی هەڵپەرکێی زانکۆی سلێمانی دوو هەڵپەرکێیان تۆمار کرد، تیپی هەڵپەرکێی ڕەشید ئەم تیپە تیپێکی هەڵپەرکێی تایبەتی بەغدا بوو. لە ناو تیپەکە جەمال جەلال‌و ژیان ئەحمەد توانیان دە هەڵپەرکێی کوردی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار بکەن، تیپی هەڵپەرکێی سینەما‌و شانۆ، یەك هەڵپەرکێیان هەبوو، شەوکەت ڕەشید ئۆپەرێتێکی تۆمارکرد زۆربەی دیمەنەکانی هەڵپەرکێ بوو، تیپەکە زۆربەیان کەسوکاری شەوکەت ڕەشید بوو، لەوانە: دوو کچی خۆی‌و سێ خوشکی، تیپی لاوانی کوردستان چوار هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی لاوانی کورد، دوو هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی لاوان دوو هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی قوتابیانی کوردستان چوار هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی هەڵپەرکێی میدیا یەك هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی نەزار بەرهەمێکیان هەبوو، تیپێکی ئەرمەنی بوو بە جلوبەرگی کوردییەوە، سێ هەڵپەرکێی نەتەوەییان هەبوو، هەولێر نۆ هەڵپەرکێیان هەبوو، ڕاهێنەرەکەیان ڕووسی بوو، زۆربەی هەڵپەرکێکانیان شێوازی نمایشی هەبوو، شێوازی ئازەری پێوە بوو، ئامادەیی کچانی سلێمانی یەك هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی هونەرو وێژەی سلێمانی دوو هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی سلێمانی دوو هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپی مەتینایەك هەڵپەرکێیەکیان هەبوو، جلوبەرگی فەیلیان لە بەر دەکرد، تیپی مامۆستایانی کوران‌و کچانی سلێمانی یەك هەڵپەرکێیان هەبوو، تیپەکانی ئافرەتان‌و بەعشیقە‌و بەرتەلە‌و ئاکرێ‌و ئافرەتانی هەولێر بە هەموویان چواردە هەڵپەرکێیان هەبووە.

لە پاڵ هونەرمەندانی کوردو تیپە کوردییەکان چەندین هونەرمەندو گۆرانی بێژی تورکمانی هەبوو، کە لە ماوەی پەخشی تەلەفزیۆنی کەرکوك بەرهەم‌و گۆرانییەکانیان پێشکەشکرد، لەوانە: (تەحسین جۆمەرد) یەکەم گۆرانی بێژی تورکمانی بوو، کە گۆرانی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کرد، عەبدولواحێد ئەحمەد گۆزەچی، ئەکرەم دووزلی، مەمەد قەلایی، عەلی قەلعەلی، محەمەد ڕەئوف، محەمەد عیزەددین نیعمەت، فەتحولا ئەحمەد، یاسین یەحیا، ئەیوب مەیان، محەمەد عەبدولواحید، فایەق شەفیق، فوئاد عوسمان، وەهاب فەخرەدین، ئەمیر عەلی، مەردان یەڵماز ئاروڵ، قەیسەر مستەفا، کەنعان گویزالسان، سەباح قەرە ئاڵتون، یەشار عەزەدین نیعمەت، شەهاب ئەحمەد، ئەو گۆرانی بێژانەی لە هەولێرەوە هاتن، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، جەبار ئەحمەد، مشکۆ، یونس خەتات، یوسف مەحمود، نورەدین عەساقلی، سالم فەتاح، نەجات ئاڵتونچی.

(تیپی نواندنی سلێمانی، نۆزدە دراما‌و کورتە تەمسیلییان هەبوو، یەکەمیان مشتەی ناو هەمانەکە کوشتمی، خوا لە سوڵتان مەحمود گەورە ترە، نرخی ئازادی، مەکری ژنان، فیلەکەی خاوەن شکۆ، من کێم، دزی زۆرزان، پیری ئاخر شەر، تیپی هاورێیان گەزیزە یانزە بابەتیان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کرد، بەرهەمەکانیان بریتی بوو لە گەزی چی.. جاوی چی، خەوەکەی مامەلی، چەم بێ چەقەڵ نابێ، زیندانێکی قوول، ئاژاوە، بووکە بە بارانێ، تیپی هونەر وێژەی کوردی مەڵبەندی گشتی سلێمانیش (١٦) بابەتیان هەبوو لە وانە: جەنابی موفەتیش، کێچ، تاوانێك لە ئاسمان، بلیت‌و زاوا، پیسکەی تەرپیر، پژمین، ژیان، گریان، تیپی هونەر وێژەی کوردی کەرکوك دوو درامایان پێشکەشکرد، مەرەزە، بەهاری دزراو، ئەم دوو بەرهەمەیان تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆماری کردو وێنەی دەرەوەی تێدا بوو، بەشدارانی دراماکە جیهاد دڵپاك، عەلی کەریم، جەلیل زەنگنە، مامۆستا محێدین، دەرهێنەری هەر دوو دراماکە سەلمان فایق بوو، تیپی هونەرو وێژەی کوردی هەولێر چوار بابەتیان هەبوو، کۆتی کۆمەڵ، گوێزان، بۆرە پیاو، هونەرو ژیان، تیپی هونەرو وێژەی بەغدا، یەك بابەتیان هەبوو بە ناوی کڵاوی بابردوو، تیپی شانۆی پێشرەوی کوردی سلێمانی، پێنج بەرهەمیان هەبوو، لە وانە لانەوازان، چەخماخە، پاڵتۆ، مۆڵەت، تیپی نیقابەکانی کرێکارانی سلێمانی، (١٣) بەرهەمی کاریکاتێری‌و (١٥) تەمسلیان هەبوو، ئەکتەرە ناسراوەکانی ئەم تیپە حاجی مەکی (عەلی ئەفەندی)، شێخ ئیسماعیل بەرزنجی، کەریم ڕەزا، عومەر چاوشین، بەشێك لە بەرهەمەکانیان ئەمانە بوو، ساڵی دوو درۆ دەکەم، بۆیاخچی، جنۆکە لە ناو قەفەسی تاوانباریدا، ئاگرم تێپەر بوو، تەمسیلەکان: ژن بە ژن، پێی بە قەد بەرەکەت ڕاکێشە، باوە ژن خوا بناسە، مامە خەمە، وێنەکەم، ماوتە کاولی کەیت، چێشتخانە، تیپی ڕۆشنبیری سلێمانی، نامەیەك لە خنکاوەوە، نەسرین، تیپی هونەری کارگەی جگەرەی سلێمانی چوار بابەتیان هەبوو، بڕیارو ئەنجام، گرێی، زێڕین، شوفێر، لە بەغداش ئۆپەرێتی مەمۆ لە لایەن ڕادیۆی بەغداوە تۆمار کرا بوو، تیپی نواندنی باواجی کۆیەش ئۆپەرێتی بیری ئازادیی تۆمارکرد، تیپی هونەری نوێی کوردی هەولێر، یەك زنجیرەیان تۆمار کرد بە ناوی فەقێ ئەحمەد، تیپی ڕادیۆی کوردی بەغدا، تەمسیلیەکیان پێشکەشکرد بە ناوی نەورۆز، یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان کەرکوك، چیرۆکی هونەرییان پێشکەشکرد، تیپی زانکۆی سلێمانی لالۆ کەریمیان پێشکەشکرد، تیپی پەروەردەی سلێمانی ئۆپەرێتی بەیتی ڕێزان کێی پێشکەشکرد.

بەرهەمە ڕەش‌و سپیەکانی تورکمانی بریتی بوو لە: (ئۆز ئیتماغی، ئۆپەرێتی فاتمە خان، ئۆپەرێتی دای کەوسەر.

بەرهەمە ڕەنگاورەنگەکان بریتی بوون لە تیپی نواندنی سولێمانی زنجیرە دراماى ژاڵەیان پێشکەشکرد، تیپی هەولێر شانۆگەری هەبوو نەبوو، تاپۆ حەقی چیە، میوانی

ناوەخت، ماڵەی سەر گردەکە، بۆ تێمناگەن، قەڵای دمدم، شانۆگەری خانەدان، خاتو کلاو زەرد (سێ ئەڵقە)، قاسپەی کەو (پێنج ئەڵقە)، محەمەد سێوێ، جەنابی جانەوەر، لاس‌و خەزال، شانۆ گەری بە زۆر کراوە بە دکتۆر زنجیرەی مۆرانە چوار ئەڵقەی پێشکەشکرد، زانکۆی سەلاحەدین تەمسیلی ئیتر تورە نابم، تیپی سلێمانی، زنجیرەی خانزاد، باڵندە کۆچەرەکان، شانۆگەری شالیار، شانۆگەری کوشتن زنجیرەی بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە، داستانی بووکی سلێمانی (پێنج ئەڵقە)، پێشکەشکرد، تیپی سەندیکای کرێکارانی سلێمانی، بووکی ژێر دەواری رەش، زنجیرەی پاداشت (چوار ئەڵقە پێشکەشکرد)، تیپی سالار، تەمسیلی تەنەکە، دڵنیایی، پێشکەشکرد.

لە دراما تورکمانییەکان حەوت ئەڵقەی پینە دۆز عوسمان‌و تەمسیلی یالانجی فەتاح‌و شانۆگەری ایکد پێشکەشکرا.

لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٠) تەلەفزیۆنی کەرکوك پەخشی رەنگاورەنگی دەستپێکرد، بۆ ئەو مەبەستە بینایەکی نوێی لەناو شار بۆ دروستکرا، کە ئێستا بارەگای تەلەفزیۆنی عێراقیەیە، تەنیشت ئێستای بارەگای مەڵبەندی دووی رێکخستنی کەرکوکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

دەستپێکردنی پەخشی رەنگاورەنگ هەنگاوێکی دیکەی تەلەفزیۆنی کەرکوك بوو، لە پێشکەوتن‌و گەشەکردن‌و فراوانبوونی پەخشی کوردی، پەخشی رەنگاورەنگ وایکرد دراماو گۆرانی کوردی رەنگاورەنگ بە لێشاو تۆمار بکرێت، تیپە هونەرییەکان، هونەرمەندان، جووڵەیەکی گەورەیان تێکەوت، بەرنامەی منالان، بەرنامە رووناکبیرییەکان گۆرانی هەمەجۆری بەسەرهات، درامایەکی زۆر تۆمارکراو پێشکەش بە بینەران کرا، دراما رەنگاورەنگەکان بریتی بوون لە (زنجیرە درامای ژاڵە، هەشت ئەڵقە) بوو، لەلایەن تیپی نواندی سولێمانییەوە تۆمارکراو پێشکەش بە بینەران کرا، یەکەم جار لەمانگی رەمەزاندا پەخش کرا، زنجیرە درامای ژاڵە لەو سەردەمەدا دەنگی دایەوە، شانۆگەری (هەبوو نەبوو) تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، درامایی (ئیتر تورە نابم) تیپی زانکۆی سەلاحەدین پێشکەشی کرد، درامایی (گەرەکەکەمان) تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، تەمسیلی (تاپۆ هەقی چیە) تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، تەمسیلی (تەنەکە) تیپی سالار پێشکەشی کرد، تەمسیلی (بووکی ژێر دەواری رەش) نەقابەکانی کرێکارانی سلێمانی پێشکەشی کرد، (مێوانی ناوەخت) تیپی نواندنی هەولێرپێشکەشي کرد، زنجیرە درامەی (مۆرانە) بریتی بوو لە چوار ئەڵقە، تیپی نواندی هەولێر پێشکەشی کرد، زنجیرە درامای (خانزاد) بریتی بوو لە سێ ئەڵقە تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، (ماڵەی سەر گردەکە) تیپی نەتەوەیی هەولێر پێشکەشی کرد، زنجیرە درامای (لۆ تێم ناگەن) بریتی بوو لە چوار ئەڵقە تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، زنجیرە درامای (پاداشت) بریتی بوو لە چوار ئەڵقە، نەقابەکانی کرێکارانی سلێمانی پێشکەشی کرد، (قەڵای دم دم) تیپی نواندنی هەولێر شانۆگەری خانەدان، تیپی نواندنی هەولێر، ئاسکە، تیپی نواندنی هەولێر نمایشی کرد، تەمسیلی باڵندە کۆچەرەکان، تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، شالێر، تیپی نواندنی سلێمانی نمایشی کرد، تەمسیلی گوڵاڵە، تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، شانۆ گەری کۆشك، تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، تەمسیلی دڵنیایی، تیپی سالار، پێشکەشی کرد، زنجیرەی بەرد لە شوێن خوێ سەنگینە، چوار ئەڵقە، تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، زنجیرەی کۆلارە، تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، زنجیرە درامای خاتو کلاو زەر، سێ ئەڵقە، تیپی نواندنی هەولێر پێشکەشی کرد، تەمسیلی محەمەدو سێوێ تیپی نواندنی هەولێر، تەمسیلی جەنابی جانەوەر، تیپی نواندنی هەولێر، تەمسیلي مەرانە، تیپی نواندنی هەولێر، تەمسیلی لاس‌و خەزال، تیپی نواندنی هەولێر، شانۆگەری خواناسەکان، تیپی نواندنی هەولێر، زنجیرەی داستانی بووکی سلێمانی، پێنج ئەڵقە تیپی نواندنی سلێمانی پێشکەشی کرد، شانۆگەری بە زۆر کراوە بە دکتۆر، تیپی نواندنی هەولێر.

لە ساڵی (١٩٩٥) چەند هونەرمەندێکی کەرکوك، بە هیوای پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی تیپە هونەرییەکانی هەولێرو سلێمانی‌و دهۆك، بەهۆی بارودۆخی ئەو کاتەی شاری کەرکوك، لەژێر دەسەڵاتی رژێمی لەناوچووی بەعس بوو، ئەو هونەرمەندانە لەژێر ناوی جۆراو جۆردا، توانیان هونەر لە شاری کەرکوك پێشبخەن‌و زۆر کاری هونەریان بۆ تەلەفزیۆن‌و رادیۆی کوردی تۆمارکردو پێشکەش دەکران، لە وانە: (تەمسیلی من شێت نیم، کێ تاونبارە، پرسیار، پەشیمانی، هاواری نامۆیی، مار، پولەکی، دۆلار، منالی زیرەك، قوتابخانە، جگە لە (١٣) ئەڵقەی کورتە چیرۆکی کۆمەڵایەتی بە ناوی دیاردە.

تەلەفزیۆنی کەرکوك جگە لە گۆرانی‌و دراماو بەرنامە رووناکبیرییەکان، منالانی فەرامۆش نەکرد بوو، چەندین تەمسیلی‌و کورتە چیرۆك‌و ئۆپەرێتی بۆ منالان تۆمار کرد، کە بە حەق توانی بەشێکی زۆر لە ئارەزووەکانی مندالان تێر بکات، لە وانە (٦١) گۆرانی مندالان تۆمارو پێشکەش کرا، لە وانە: (٤٧) گۆرانی رەش‌و سپی بوو، (٢٧) پارچە مۆسیقا بۆ منالان، پێنجیان بادینی بوو، زۆربەی پارچە مۆسیقاکان گۆرانی مندالان تێهەلکێش کرا بوو، جگە لەو گۆرانی‌و پارچە مۆسیقایانە ئەم ئۆپەرێتانەش پێشکەش کرا ئۆپەرێتی رێوی‌و شێر، تیپی رۆشنبیری کۆمەڵانی هەڵەبجە پێشکەشی کرد، ئۆپەرێتی سەوزە، مندالانی هەڵەبجە پێشکەشیان کرد، ئۆپەرێتی شادی، مندالانی هەولێر، پێشکەشیان کرد، بەلەمی ئەفسوناوی، کۆمەڵەی چاودێری کۆمەڵایەتی سلێمانی پێشکەشی کرد، ئۆپەرێتی دەست پاکی، مندالانی هەولێر پێشکەشیان کرد، بەهاری ژیان، باخچەی پەری لە سلێمانی، پێشکەشیان کرد، شانۆگەری پێلاوی سوور لاوانی سلێمانی پێشکەشیان کرد، ئۆپەرێتی نیشتمان‌و چەند گۆرانییەکی فلکلۆری مندالانی هەولێر پێشکەشیان کرد.

یەکەم ساڵی یادکردنەوەی ئینقلابەکەی تەمموزی ساڵی (١٩٦٨)، وەفدێکی حکومەت، کە پێکهاتبوو لە سەعدون

غیدان ومورتەزا حەدیسی سەردانی کەرکوکیان کرد، وەفدەکە لە سەردانەکەیدا بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسیان بینی، لەو دیدارەدا داوا لە وەفدی حکومەت کرا، پەخشی کوردی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك هەبێت، سەعدون غێدان هەر لەوێدا بڕیاری دا پەخشی کوردی دەستپێبکات، برادەرانی باڵی مەکتەبی سیاسی نامیق وشەهید جەبار جەباریان دانا، سەرەتا ماوەی پەخشی کوردی (١٥) دەقیقە بوو، دوای مانگێك لە دەستبەکاربوونی نامیق وازی هێنا، باڵی مەکتەبی سیاسی لە جیاتی نامیق پێشنیاری هاشم جەباریان کرد، هۆکاری دانانی هاشم جەباری دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك لە وانە: کاك هاشم لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی شارەزایەکی باشی هەبوو، دەسی نووسینی پەخشان وشیعری هەبوو، ئەندامێکی چالاکی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، ئاگاداری بارودۆخی عێراق بوو، جێی باوەڕی برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، مام جەلال خۆی پشتگیری هاشم جەباری کرد بۆ کار کردن لە تەلەفزیۆنی کەرکوك، ئەو کاتە هاشم جەباری لە هەولێر بوو لە سەر پشتیوانییەکەی مام جەلال مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبیحی نامەیەکی بۆ لقی کەرکوکی پارتی دیموکراتی کوردستان نارد، بۆ دانانی هاشم جەباری لە جێگای نامیق.

هاشم جەباری لە ڕۆژی دەستبەکاربوونی چوو بۆ تەلەفزیۆن (یەحیا جەمیل حومادی) بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن بوو، دوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ بەڕێوەبەر هەر ئەو ڕۆژە واتا (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٩) داوای لێکرد کە هەواڵەکان بخوێنێتەوە، بێ تاقیکردنەوەو بۆ یەکەم جار لە شاشەی تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە هەواڵەکانی خوێندەوە، ماوەی هەواڵەکان شەش دەقیقە بوو، دەرکەوتنی لە شاشەی تەلەفزیۆنی کەرکوك دەنگی دایەوە، لە زۆربەی شوێن وجێگاکانی کوردستان بە تایبەتی لە هەولێر پەیوەندییەکی زۆری پێوە کراو پیرۆزبایان لێکرد.

هەموو بەیانامەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی لە کەرکوك، کە زیاتر شەهید عەلی عەسکەریو خوالیخۆشبوو عومەر دەبابە دەیاننووسی، هاشم جەباریش لە تەلەفزیۆن دەیخوێندەوە.

زۆربەی ئەو دەسکەوتانەی کە لەسەر داوای باڵی مەکتەبی سیاسی هاتەدی، لە بەرنامەو هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی کەرکوك باسیان دەکرد، بۆ نمونە (کردنەوەی زانکۆی سلێمانی) بە پارێزگاریکردنی دهۆك، دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد، دانپیانان بە جەژنی نەورۆزو دەسکەوتەکانی تر، کە سەرەتایەك بوو بۆ بەیاننامەی (١١) ئازار.

هاشم جەباری لە بەشێکی دیکەی بیرەوەرییەکانی باسی پەیوەندییەکانی دەکات لەگەڵ ڕووناکبیرانو هونەرمەندانی کوردستان دەکات ودەڵێ:

"پەیوەندیم لەگەڵ هەموو ڕووناکبیرانو هونەرمەندانی کوردستان، پەیوەندی برایانە بوو، هاتوو چۆ لەنێوانماندا هەبوو، تەنانەت هەندێکیان کە دەهاتن بۆ تۆمار کردنی بابەتەکانیان یان بەرنامەکانیان لە ماڵی من دەخەوتن، تەنانەت بۆ حاجی مەکی (دەستێك بیجامەی) تایبەتم بۆ کرد بوو".

یەکێك لە بیرەوەرییەکانی هاشم جەباری لەگەڵ حاجی مەکی، دوای هەرسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥) حاجی مەکی هات بۆ کەرکوك، منیش لە یانەی (تجارة) میوانداری کرد، حاجی مەکی نەیدەخواردەوە، عەبە مل کوڵ لە یانەکە دانیشتبوو، عەبە مل کوڵ بەڵێندەر بوو، کە حاجی مەکی هاتە لامان وتی میوانی منن، ئەو ڕۆژگارە باردۆخی کوردستان خراپ بوو، بەعس زۆر مەغرور ببوو، شۆڕشی کورد هەرەسی هێنا بوو، وێنەگرێك لە ناو یانەیە بوو، وێنەی بە (٥٠) فلس دەگرت، عەبە مل کوڵ بانگی وێنەگرەکەی کردو پێی وت بای (٥٠) دینار وێنەمان بگرە، حاجی مەکی وتی بە خوا نابێ، عەبە مل کوڵ وتی بە خوا ئەبێ، بگرەو بەردەی ئەبێ و نابێ حاجی مەکیو عەبە مل کوڵ زۆری خایاند، ناچار عەبە مل کوڵ ووتی بە سەری بارزانی ئەبێ، لە تاوا حاجی مەکی ووتی ئەبێ ئەبێ. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ کاك ئەنوەر قەرەداغی، ئەویش بهاتبایە کەرکوك، لە ماڵی هاشم جەباری دەخەوت.

شەوکەت ڕەشید یەکێك بوو لە هونەرمەندە دەگمەنو بەتواناکانی کەرکوكو کوردستان، یەکێك بوو بە تەنها ئاهەنگێکی دەگێڕا، ژەنینی ئامێرەکانی (کلارنێت، جەمبوش، عود، کەمان) بە تەنها هەموو ئەو ئامێرانەی دەژەنی، یەکێك لە داهێنانەکانی کاك شەوکەت لەسەر ئامێری کلارنێت، کە ئامێرێکی تورکییە، شەوکەت ڕەشید توانی گۆڕانکاری لەو ئامێرە بکاتو تۆنو دەنگەکەی خۆشتر بکات، شەوکەت ڕەشید پەیوەندییەکی یەکجار فراوانی هەبوو لەگەڵ زۆربەی کەسایەتییەکانی کەرکوكو کوردستان، پیاوێکی خۆش مەجلیسو قسەخۆشو نوکتەزانو حازر بەدەست بوو، خاوەن کەسایەتییەکی تایبەت بووو ڕێزی زۆری هەبوو لە خەڵکی بەگشتی ولە ناو هونەرمەنداندا بەتایبەتی، پێش ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١، جەڵتەیەکی سووك لە شەوکەت ڕەشیدیدا داو لە دواییدا کۆچی دوایی کرد.

ئێزگەی گەلی کوردستان چەندین وتارو ڕاپۆرتی لەسەر ڕزگارکردنی هەولێری خوێندەوە، شەوکەت ڕەشید فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوەو وتی: (برادەران من دەمرمو کوردستان ڕزگاری دەبێو نایبینم).. شەوکەت ڕەشید ماڵەکەی بۆ هەموو هونەرمەندانی کوردستان کراوەبوو، پیاوێکی بەرچاو تێر بوو، خۆشەویستی دۆستو برادەرەکانی بوو، لە دوای بەیاننامەی ١١ی ئازار، شەوکەت ڕەشید سروودێکی نیشتمانی تۆمارکرد، ناوی بارزانی تێدا بوو، دوای تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتو شۆڕشی کوردو پەشیمان بوونەوەی حکومەت لە بەڵێنەکانی بەرامبەر کورد، داوا لە هاشم جەباری کرا ئەو سرووده بسڕێتەوە، بەڵام هاشم جەباری سروودەکەی نەسڕییەوەو تەنها لە سەری نووسیبوو : (ئەم بابەتە لە حاڵی حازردا نمایش ناکرێ، ڕۆژێکی ساڵی ١٩٧٤، لە گەرمەی شەڕی کوردو حکومەت، لە بەشی گۆرانی داوا لە فەیحا زەینولعابیدین کرا گۆرانییەك دابنێ بۆ پێش هەواڵەکان، (فەیحا)ش تورکمان بوو، نەیزانی ئەو سرووده بەسەر بارزانیدا وتراوە، ئەوەی نمایش کرد، لەسەر نمایشکردنی ئەو سرووده هەرایەکی

گەورە دروستبوو، بە نەقڵکردنی شەوکەت ڕەشید بۆ بەسرە کۆتایی هات.

بیرەوەرییەکانی لەگەڵ هونەرمەند حەسەن گەرمیانی دەڵێ: "حەسەن گەرمیانی مامۆستا بوو، حەسەن گەرمیانی پیاوێکی ڕێکوپێکو سالارو ڕێزدار بوو، هیچ ڕۆژێك باس کەسێکی نەکردووە بە خراپە، لە پشتی هاوڕێکانییەوە قسەی نەکردووە، پیاوێکی لە سەرخۆو سەنگین بوو، لە خێزانێکی هونەر پەروەر بوو، برا گەورەکەی حوسێن خاوەن دەنگێکی ئێجگار خۆشو پر سۆز بوو، براکەی دیکەی مەهدی ئومێد دەرهێنەرێکی شارەزاو ئەکتەرێکی بە توانا بوو، برازاکانی هێمن حوسێنو براکەی دوو هونەرمەندی زیرەكو لێهاتوو بوون کاك حەسەن خاوەن هەستێکی ناسکی هونەری بوو، تەلەفزیۆنی کەرکوك لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی مەوعیدێکمان هەبوو، بۆ تۆمارکردنی کۆمەڵێك گۆرانی، حەسەن گەرمیانی دانی هەڵکەندبوو، ئیشی زۆر بوو، بە زۆر مەقامێکیان پێ تۆمار کرد، ماوەی (١٣) دەقیقە بوو، لە مەقامو گۆرانییەکەدا (نەشازێك) هەیە، هەموو کەس هەستی پێ ناکات کە دوای ئەوەی چەند جارێك بڵاومان کردەوە، حەسەن گەرمیانی داوای لێ کردم کە ئەو بەرهەمە بڵاو نەکەینەوە، حەسەن گەرمیانی یەکێك بوو لە هونەرمەندە نەفس بەرزەکان، قەت داوای نەدەکرد گۆرانییەکانی پەخش بکرێت، یان قەت داوای نەکردووە بەرهەمێکی بۆ تۆمار بکرێت، زۆر ڕێزی لە خۆی دەگرتو قەت سەری بۆ پلەوپایە دانەنواندو کاتێك مامۆستا بوو، لە یەکێك لە گوندەکانی کوردستان، دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆیەوە کە حەسەن گەرمیانی چووەتە ناو ڕیزی شۆڕشەوەو بووە بە پێشمەرگە، بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن داوای کردووە لەمەودوا بەرهەمەکانی حەسەن گەرمیانی پەخش مەکەن چونکە بووەتە پێشمەرگە، منیش لە وەڵامدا وتم، حەسەن گەرمیانی لە فلان گوند مامۆستایە، بەڕێوەبەر وتی: زانیارییەکان وا ناڵێ، پاش ماوەیەك حوسێن برای حەسەن گەرمیانیم بینی، بۆی باسکردم، کە حەسەن مامۆستایە، بەڕێوەبەرم ئاگادار کردەوە، بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن وتی: پێم خۆشە حەسەن گەرمیانی ببینم، حەسەن گەرمیانیم ئاگادار کردەوە، حەسەن گەرمیانی لە وەڵامدا وتی: دەهاتم بۆ لای، بەڵام چونکە گۆرانییەکانمی ڕاگرتووە، گۆرانییەکان بسڕێتەوە نایەم بۆ لای، بە بەڕێوەبەرم وت: حەسەن گەرمیانی ئەڵێ نەك گۆرانییەکانم ڕاگرێ هەموو گۆرانییەکانم بسڕێتەوە نایەم بۆ لای، بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن وتی: ئەم پیاوە دەخەمە سەر سەرم، بەراستی ئەمە هونەرمەندە، ئیتر سانسۆری سەر گۆرانییەکانی حەسەن گەرمیانی هەڵگرت.

تەلەفزیۆنی جارانی کەرکوك، لە ماوەی (٣٤) ساڵی تەمەنیدا، دەیان هونەرمەندو گۆرانی بێژی لە کەرکوك پێگەیاند، دەتوانین بڵێین تەلەفزیۆنی کەرکوك ببووە قوتابخانەو فێرگەیەکی گرنگ بۆ کورد لە باشووری کوردستان، چ لە بواری هونەریو پێگەیاندنی هونەرمەندان، چ لە بواری ڕۆژنامەگەریو پێگەیاندنی کادری بە تواناو لێهاتوو لە بواری ڕاگەیاندن، چونکە تەلەفزیۆنی کەرکوك، جگە لە ڕادیۆی کوردی بەغدا، کورد خاوەن هیچ دەزگاو دامەزراوەیەك نەبوو بۆ گەشە پێدانو ئەرشیفکردنو بە دۆکیۆمێنتکردنی کولتورو کەلەپوری تایبەت بەخۆی.

کۆی ئەو گۆرانیبێژە کەرکوکیانەی کە لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بەرهەمەکانیان تۆمارکرد زیاتر لە (٤٢) گۆرانیبێژو هونەرمەند بوو، سەرجەمی گۆرانییەکانیانیشیان (٢٣٣) بەرهەمی هونەری گۆرانی وتن بوو، کە لە تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کرا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا سامانێکی هونەری گەورە بوو بۆ هونەرمەندانی کەرکوك، کە کاریگەری ئەرێنی هەبوو لەسەر کایەی هونەری لە کوردستانو باشترین دەرفەتیش بوو بۆ هونەرمەندانو گۆرانی بێژانی کورد بە گشتیو کوردی کەرکوك بە تایبەتی بۆ دەولەمەندکردنی ئەزمونەکانیان. بوونی تەلەفزیۆنو گرنگییەکەی ئەوەندە گەورەبوو هونەرمەندانی ئەو عەیامە قەرزاری تەلەفزیۆنی کەرکوکن، چونکە تەلەفزیۆن هۆکارێکی سەرەکی بوو لە گەشەکردنی هونەرو گۆرانی کوردی لە کەرکوك. گۆرانی بێژانو هونەرمەندانی کەرکوك لە ماوەی ئەو(٣٤) ساڵەی تەمەنی تەلەفزیۆنی کەرکوك بوونە بنەماو هەوێنی نەوەی دوای خۆیان.

ئەگەر سەیری خەرمانی بەرهەمەکانی هونەرمەندان بکەین لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بەم جۆرەیە: (عەلی مەردان (١٨) مەقامو گۆرانی، سەلاح داودە، سێ گۆرانیو مەقامێك، فایەق داودە (١١) گۆرانی، نەوزاد ئەحمەد داود (١) گۆرانی، شەوکەت ڕەشید حەوت گۆرانی، قادر مەردان (٩) گۆرانی، عەلی عەزیز (١٨) گۆرانی ڕەشو سپی، سێ گۆرانی ڕەنگاوڕەنگ، عەباس محەمەد (٧) گۆرانی، حەسەن غەریب (٢٤) گۆرانی، عەلی زەنگنە (١٩) گۆرانی، نۆڤەر محێدین دوو گۆرانی، ئەجمەددین جومعە سێ گۆرانی، واحید تەنیا شەش گۆرانی، وەشیار ئەحمەد ئەسوەد چوار گۆرانی، هێرش فاتیح چوار گۆرانی، هێمن حوسێن دوو گۆرانی، ئەبو بەکر محەمەد چوار گۆرانی، ئیبراهیم ئەحمەد حەوت گۆرانی، ئیحسان کەرکوکی یەك گۆرانی، بورهان جەباری پێنج گۆرانی، حەمە ڕەووف کەرکوکی دوو گۆرانی، خەسرەو سالح چوار گۆرانی، ڕزگار سەید عەلی دوو گۆرانی، سیروان عومەر پێنج گۆرانی، سەدیق شەیدا هەشت گۆرانی، سامان محەمەدو سیروان ئەحمەد هەر یەکەیان گۆرانییەك، سابیر کوردستانی هەشت گۆرانی، عوسمان بەکر پێنج گۆرانی، عیماد تەنیا دوو گۆرانی، عەلی بابان دوو گۆرانی، فەتاح ڕەزایی هەشت گۆرانی، کەمال محێدین دوو گۆرانی، کەریم باوایی یەك گۆرانی، کاکەمەند سەمەد دوو گۆرانی، محەمەد عەباس بارام دوو گۆرانی، مەریوان شەوکەت سێ گۆرانی، نیاز گەرمیانی یەك گۆرانی، حوسێن عەلی نزیکەی حەوت گۆرانی، محەمەد گەرمیانی پێنج گۆرانی، خالید جوانرۆ پێنج گۆرانی، ئاسۆ تاهیر شەش گۆرانی، تەها محەمەد یەك گۆرانی، عەبدولرەحمان زەنگنە دوو گۆرانی، سەباح مەریوانی زیاتر لە ١٥ گۆرانی.

سابیر کوردستانی کارمەندی تەلەفزیۆنی کەرکوك بوو، چونکە نابینا بوو، دەوامی نەدەکرد، مانگانە هاشم

جەباری موچەکەی بۆی وەردەگرد، موچەکەی سێ هەزار دیناری چاپ بوو، سابیر تەرحیل کرا بوو بۆ کوردستان، ڕۆژێك بەڕێوەبەرایەتی ئەمن ئاگادارمیان کردەوە کە سابیر کوردستانی لە کەناڵی کوردسات گۆرانی تۆمار کردووە، داوایان لێکردم ئەگەر هات بۆ موچەکەی دەمانەوێت بیبینین، سابیر کوردستانی هاتو تەلەفۆنی بۆی کرد، لە ئەحمەد ئاغا چاوی پێکەوتو ئاگاداریکردەوە کە فەرمانی گرتنی هەیە، ئیتر نەیەت بۆ کەرکوك‌و باشتر وایە لە ڕێگەی هەولێرەوە بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی نەیگرن.

خالید دلێر لە پشتی پێگەیاندنی هونەرمەند عەباس محەمەدەوە بوو، هەردوو گۆرانی (وەی وەی، بۆ یەك شەو) ئاوازی ئەم دوو گۆرانییە هی خالید دلێرە، تەنانەت شیعری گۆرانی وەی وەی هی خالید دلێرە.

مێژووی تەلەفزیۆنی کەرکوك، مێژوویەکی دەوڵەمەندو پڕ بایەخەو ئەرشیفی سێ دەیەی ڕووناکبیران‌و هونەرمەندانی کوردە، جگە لە بەرنامە جۆراوجۆرەکانی‌و گۆرانی‌و مۆسیقا، پڕە لە حیکایەتی تاڵ‌و شیرین‌و قسەی خۆش‌و نوکتەو قسەی نەستەق، دەیان حیکایەت‌و قسەی نەستەقی (٣٤) ساڵی تەلەفزیۆنی کەرکوك بووەتە بەشێك لە زاکیرەو بیرەوەرییەکانی هاشم جەباری‌و بووەتە بەشێکی جوانی ئەرشیفی تەلەفزیۆنی جارانی کەرکوك.

فایەق داودە یەکێك لەو هونەرمەندانە بوو کە ژیانێکی کولە مەرگی بەسەر دەبرد بە تایبەتی لە سەردەمی شەڕی عێراق‌و ئێراندا بارودۆخی ژیانی زۆر دژوار بوو، خەڵکی بە تەواوەتی پشتیان لە زەماوەندو ئاهەنگ گێڕان کردبوو، چەند ڕۆژێك پێش جەژن هاشم جەباری فایەق داودەی بینی لە ئەحمەد ئاغا لەسەر سینی هەناری دەفرۆشت، دەربارەی بارودۆخی ژیانی پرسیاری لێ کردو وتی: وەزعم زۆر خراپەو لە حاڵەتی ژیان‌و مردندام‌و مناڵەکانم ڕەش‌و ڕووتن‌و دەستیشمان زۆر کورتە، پێی وت: هەر چونێك بووە سبەی وەرە بۆ تەلەفزیۆن گۆرانییەك تۆمار بکە بەڵکو بڕێك پارەت دەدەینێ، فایەق ڕۆژی دواتر هات بۆ تەلەفزیۆن‌و گۆرانییەکی هێنا، ئاوازو شیعر وتنەکەی بە ناوی خۆیەوە بوو، لەو ڕۆژگارەدا (٨٠) دینارم بۆ سەرف کرد، ڕووداوێکی تر لە فایەق داودە دەگێڕێتەوە ودەڵێ: فایەق داودە داوایکرد بیکەینە بێژەر، منیش داوام لێکرد کاری وەرگێڕان (تەرجەمە) دەزانی؟ وتی: بەڵێ، منیش بابەتێکم دایەو وتم: هەتاوەکو دێمەوە ئەم بابەتە تەرجەمە بکە.. کە گەڕامەوە، فایەق ڕۆیشتبوو بەلام بە پەروینی بێژەری گوتبوو: "هاشم جەباری من وەرناگرێت چونکە دەترسێت جێگاکەی بگرمەوە".

هونەرمەند عەلی عەزیز، یەکەم هونەرمەند بوو گۆرانییەکی بە ناو کچی کەرکوك تۆمارکرد، عەلی عەزیز جگە لە گۆرانی، ژەنیارێکی باشی ئامێری (سلسیفۆن) بوو، تەنها هیوای ئەوە بوو ژن بێنێ‌و منداڵێکی کوڕیان ببێت، دواتر عەلی عەزیز ژنی هێنا و یەکەم منداڵیشیان کوڕ بوو، لە هەمووی ناخۆشتر بەسەرهاتێکی ناخۆش بوو کە تێیدا هونەرمەند عەلی عەزیز سەری نایەوە! چیرۆکەکەش بەم شێوەیە بوو: کاتێك کە منداڵەکەیان بوو لە تەخۆشخانە ئیتر ئەم لە نەخۆشخانە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە لە خۆشیا ئەو شەوە کەمێك سەری گەرم دەکات، لە بیری دەچێت‌و سۆپاکە بکوژێنێتەوە ماڵەکەی گڕی تێبەردەبێت‌و بە تەواوی دەسوتێت‌و هونەرمەند عەلی عەزیز دەسوتێت‌و دەمرێت‌و بۆ دواجار منداڵەکەی نابینێتەوە!!

قادر مەردان بە تەنها بۆ خۆی قوتابخانەیەك بوو، جگە لە وەی خۆی گۆرانی بێژ بوو، ئاوازدانەرێکی بە تواناش بوو، ئاوازی بۆ هونەرمەندان دادەنا، دوا هەمین ئاوازی بۆ گۆرانیبێژ هێمن حوسێن دانا بە ناو (دایە). قادر مەردان ئێستا لە ئەوروپا دەژی‌و نەخۆشە، ماوەیەك لە یەکێك لە تیپە بیبانییەکان ژەنیار بوو، ئاوازەکانی قادر مەردان، بەردەوام جۆرێك لە نامۆیی تێدایە، لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو گۆرانی ( بێ ئومیدی ) بەجۆرێك دەنگی دایەوە لە هەموو چایخانەکانی گەڕەکە کوردییەکان ڕۆژانە چەندین جار لێدەدرا.

دەرکەوتنی عەلی زەنگنە وەك گۆرانی بێژ لە زنجیرە درامای مەرەزە دەرکەوت، کە لە دیوەخانی ئاغادا گۆرانی دەوت، لە مەرەزە یەکەم هەنگاوی بەرەو دونیایی گۆرانی نا، هاشم جەباری باسی هەلوێستێکی عەلی زەنگنە دەکات لە دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١)و دەڵێ: "عەلی زەنگنە لە قصر کەرکوك گۆرانییەکی لە سەر کەرکوك‌و کوردستان وت، لە وێدا عەلی زەنگنە زۆر چووە دڵمەوە، لەوەوە بووینە هاوڕێ، شیعری گۆرانی نەگۆڕاوم بۆی دانا، مەبەستی من لە شیعرەکە ئەوە بوو، کە چۆن کاتی خۆی ئەندام بووم لە ناو باڵی مەکتەبی سیاسی، ئێستاش هەر یەکێتیم، ئاوازی گۆرانییەکە کوڕێك داینا ناوی فەخرەدین بوو".

حەسەن غەریب هونەرمەندێکی بەتوانا ولێهاتوو بوو، باوەڕی بە خۆی هەبوو، پشتی بە خۆی دەبەست‌و خۆشەویستیەکەی لەوەدا بوو، کە خۆی خۆی پێگەیاند. حەسەن غەریب هەموو جارێك دەیوت: "من لە شاگردی نانەواخانەوە خۆم پێگەیاند".

یەکێك لە کۆسپەکانی بەردەم بەشی کوردی تەلەفزیۆنی کەرکوك، یەکێك لە بەڕێوەبەرەکان بوو، ناوی (محەمەد ڕەزا کازم) بوو، لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٣)، بووە بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی کەرکوك بە وەکالەت، لە سەرەتاوە تا خۆی جێگیر کرد هەڵس‌و کەوتی باش بوو، دواتر دەستی کرد بە دروستکردنی کۆسپ‌و تەگەرە لە بەردەم پەرەپێدانی بەشی کوردی کەناڵەکە، تا گەیشتە ئەوەی هەڕەشە لە سڕینەوەی گۆرانییەکانی هونەرمەندی گەورەو دەنگخۆش حەسەن زیرەك بکات بە بیانووی ئەوەی گوایە لەگەڵ داب‌و نەریتی کۆمەڵگادا ناگونجێت، ئینجا هەڕەشەکردنی لەسەر سڕینەوەی هەموو ئەرشیفی کوردی تەلەفزیۆن! پاساوەکەشی ئەوە بوو گوایە لە خاڵی سفرەوە دەست پێدەکاتەوە، هەر ئەم بەڕێوەبەرە، نەسرین‌و پەروین کە دوو بێژەری بە توانا بوون، گواستیانیەوە بۆ هەولێرو سلێمانی.

یەکێکی تر لە بەڕێوەبەرە خراپەکان (عەبدولجەبار ئەحمەد سوڵتان) بوو، ئەمە بەعسیەکی پلە داربوو، خەڵکی موسڵ بوو، یەکێك بوو لە شۆفێنییە بەعسییەکان‌و دوژمنی کوردبوو، لە ڕۆژی دەستبەکاربوونییەوە دەستیکرد بە

گواستنەوەی بەشێکی زۆری کارمەندانی کوردو تورکمان‌و هێنانی خەڵکی موسڵ لە جیاتیان‌و تەنانەت ئەوانەی لە ناو بارەگای تەلەفزیۆن دەخەواند.

بە پێچەوانەی ئەو دوو بەڕێوەبەرەوە، (تاریق عەلوان) کە خەڵکی بەغدا بوو، زۆر هاوگونجاو بوو، هەموو ساڵێك لە نەورۆزدا پێداگری دەکرد لە یادکردنەوەی نەورۆزو ئاهەنگ گێڕان. تەنانەت لە یەکێك لە ساڵەکان، کۆمەڵێك هونەرمەندی بەغدای هێنا بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك بۆ ئاهەنگی نەورۆز لە وانە: (ئەحلام وەهبی، ئەمەل خزەیر، یاسر خزر) ئەم هونەرمەندانە لەگەڵ هونەرمەندە کوردەکان لە ناو ستۆدیۆ ئاهەنگی نەورۆزیان گێڕا، هەر لە سەردەمی ئەم بەڕێوەبەرە کۆمەڵێك بەرهەمی کوردی لە گۆرانی‌و شانۆگەری‌و زنجیرە درامای کوردی تۆمار کرا، بۆ نموونە زنجیرە درامای لالۆ کەریم‌و تۆمارکردنی بەشێك لە گۆرانی گۆرانیبێژەکانی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیەو تیپی مۆسیقای سلێمانی‌و هەولێر. تاریق عەلوانی بەڕێوەبەر، مادەکانی سەمای شەرقی لە کەناڵەکە هەڵگرت چونکە پێی وابوو لەگەڵ دابو نەریتی کوردیدا ناگونجێت‌و لە بری ئەوە هەڵپەڕکێی کوردەواری دانا.

دوای جەنگی (قادسیة) میهرەجانێکی شیعر خوێندنەوە لە هەولێر دەستی پێکرد بە ئامادەبوونی (سەرانی بەعس) یەکێك لەو کەسانەی شیعری خوێندەوە کە دەڵێ: دایە کە منداڵ بووم چۆلەکەیەك کەوتە حەوشەکەمانەوە بە برینداری، منیش دان‌و ئاوم دایەو دواتر ڕۆیشت) یەکێك لە کارمەندانی تەلەفزیۆنی ئەو کاتی کەرکوك، بە بەڕێوبەری وتبوو: ئەم شیعرە مانای سیاسی‌و پشتیوانیکردنی لە کورد تێدایە چۆن ڕێگەتان داوە لە تەلەفزیۆن بخوێندرێتەوە! ئەم شیعرە لە چوار چێوەی بەرنامەی (ڕۆژنامەوانی تیڤی)دا هات کە برای بەڕێزم (شێرزاد عەبدولڕەحمان) ئامادە وپێشکەشی دەکرد.

دواتر بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن تەلەفۆنی بۆ کردم‌و گوتی: "ئەو بەرنامەیەت فەحص کردووە، منیش گوتم: (نەخێر) ئینجا وتی: دوای ئەوەی بەرنامەکە تەواو بوو شیعرەکەم بۆ فەحص بکەو ئاگادارم بکەوە..!"، دواتر من‌و ئەو برادەرەی کە خەبەری لێمدابوو، شیعرەکەمان فەحص کرد، من وتم بە لامەوە ئاساییە، بەڵام ئەو وتی: (نەخێر ئاسایی نیە) بە مەبەست‌و بۆ پێشمەرگە وتراوە! منیش وتم بۆ چی بەم جۆرە تەرجەمەی دەکەی، مەبەست لە شیعرەکە کەسێکی فەلەستینی (فدائی فەلەستینە)؟! ئینجا ئەو وتی: شیعرەکە بە کوردی خوێندراوەتەوە! منیش وتم: مامە ڕیشە، پێش ئەوەی پێشمەرگە بێت فیدائی فەلەستین بووە (مەبەستم لەم نموونەیە ئەوەبوو کە خۆم لەم کێشەیە ڕزگار بکەم) بەڵام وادیاربو ئەوان هەر سووربون لەسەر ئەم کێشەیەو وازیان لێم نەهێنا، کێشەکەیان گەیاندە دائیرەی ئەمن، ئیتر ئەوەبوو هاتنە تەلەفزیۆن بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەن‌و دەرەنجام سزای ئیداریمیاندا.

بەڵام من وازم نەهێناو بە دوای ئەم مەسەلەیە ڕۆیشتم، شێرزاد عەبدولڕەحمان ئامادەکارو پێشکەشکاری بەرنامەکەم بینی‌و کاتێك بۆم دەرکەوت کە خاوەنی شیعرەکە (ڕۆستەم باجەڵان) بەبۆنەی شیعرەکەوە پارچەیەك زەوی لە هەولێر وەرگرتوەو کەچی منیش لەو لاوە لەسەری سزا دراوم، ئیتر کە ئەم مەسەلەیەم زانی ڕووبەڕوو ڕوونکردنەوە (یاداشتێکم) بۆ بەڕێوەبەری گشتی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی عێراق (ماجد ئەحمەد) بەرزکرەوەو پێم ڕاگەیاند: من بە هۆی ئەو شیعرەوە سزا دراوم‌و کەچی لەو لاشەوە خاوەنی شیعرەکەتان بە پێدانی پارچەیەك زەوی خەڵات کردووە! ئینجا کە بەمەی زانی، سزاکەی لەسەرم لابردوپاداشتی کردم بە بڕی ١٠٠ دینار کە بۆ ئەوکاتە زۆر بوو.

سەرەتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، پەیوەندییەکانی نێوان کوردو تورکمان بە هۆی ڕووداوە تاڵەکەی (١٩٥٩)وە زۆر خراپ بوو، لەو سەرو بەندەدا گەنجانی موسەڵلا لە هەر جێگایەك فرسەتیان بهێنایە غەدریان لە کورد دەکرد.

دوای کردنەوەی تەلەفزیۆنی کەرکوك لە کۆتایی شەستەکان، ڕۆژێك لەگەڵ کارمەندە تورکمانەکان باسی ئەو ڕووداوەی کرد، یەکێك لە کارمەندەکان ناوی (ماجد) بوو، ووتی: من یەکێك لەو گەنجانە بووم، ئیتر لەوەوە بوونە هاوڕێی یەکتر.

شوێنی تەلەفزیۆن بە دووری (١٠) کیلۆمەتر لە ناوەندی شارەوە دوور بوو، لەسەر ڕێگای بەغدا–کەرکوك ئەو عەیامە بارەگای تەلەفزیۆن تەنها بینابوو لە شوێنێکی چۆڵدا، چونکە تاوەری پەخشی تەلەفزیۆنەکە زۆر بەرزبوو، (٣٢١) مەتر بەرز بوو بە هۆی ئەو بەرزییەوە بۆ ڕاگرتنی تاوەرەکە، ڕووبەرێکی زۆری بۆ تەرخانکرا بوو، تاوەری تەلەفزیۆنەکە کۆمپانیایەکی ئەڵمانی دروستی کردبوو، سێ ساڵ جارێك ئەندازیارێکی ئەڵمانی لە کۆمپانیاکەوە دەهات بۆ نۆژەنکردن‌و سیانەکردنی تاوەرەکە، بینای تەلەفزیۆن بریتی بوو لە ژوورێك بۆ بەڕێوەبەرو ژوورێك بۆ ئەندازیارەکان‌و چەند هۆڵێك، یەکێك لە هۆڵەکان تەرخانکرابوو بۆ ڤیدیۆ، پەخش ژوورو هۆڵ خۆی هەبوو، هەروەها بەشەکانی تر، بە دوو شەفت دەوام دەکرا، بەیانیان‌و ئێواران، ستۆدیۆی هەواڵ ژوورێکی زۆر بچوك بوو، کونترۆڵکردنی کامێرای بەشی هەواڵ لە هۆڵێکی ترەوە بوو.

تەنها بەڕێوەبەر ئۆتۆمبێلی هەبوو، ئۆتۆمبیلەکەی جۆری (ڤۆلکس واگن) بوو، کارمەندەکان بە ئۆتۆمبیلێکی (١٨)نەفەری جۆری مارسیدس لە بەردەم چایخانەی مەجیدییەوە دەگوازرانەوە بۆ تەلەفزیۆن‌و مانگانە (بودجە)ی تەلەفزیۆنەکە تەنها (٣٠) دینار بوو، بەیانیان کارمەندەکان لە چێشتخانەیەکی بچوکی بەرامبەر چایخانەی مەجیدییە نان‌و ماست‌و پەنیرو هێلکەیان دەخوارد.

ڕووبەری زەوییەکەی تەلەفزیۆن زۆر فراوان بوو ئێمە پێشنیازمان کرد، لەو زەوییە خانوو بۆ کارمەندان دروست بکرێت، بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن ڕازی بوو، پارێزگاری ئەو زەمانە (خالید تەبرە) بوو، داوای لیستێکی کرد بە ناوی کارمەندانەوەو داوایکرد ئاماژە بە نەتەوەی کارمەندان بکرێت، کە لیستەکە بۆ پارێزگار بەرز کرایەوە بە هۆی ناوە کوردی‌و تورکمانییەکانەوە داواکە ڕەتکرایەوەو هەندێك جار

پێش وادەی چوونیان دەچوون بۆ چایخانەی مەجیدییە، یاری دۆمینەیان دەکرد لەسەر ژەمەخواردنی چێشتخانەی (سەرکیس) کە یەکێك بوو لە چێشتخانە کۆنەکانی کەرکوك، خاوەنەکەی مەسیحی بوو، شلەو برنجییێکی زۆر بە تام و لەزەتی هەبوو، خەڵکی بۆ بانگهێشتکردنی یەکتری لە چێشتخانەی سەرکیس نانیان دەخوارد، هەر بە تەنیشت سەرکیسەوە عوسمان کەبابچی بوو کە یەکێك بوو لە کەبابخانە هەرە کۆنەکانی کەرکوك بوو، ماڵە دەوڵەمەندەکان بە پایسکیل کەبابیان بۆ دەچوو.







چەند گرتەیەك لە دراماکانی تەلەفزیۆنی کەرکوك



تیپەكانی هەولێر لە كاتی دراماكاندا



چەند گرتەیەك لە دراماكانی تەلەفزیۆنی كەركوك



لە کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکاندا



تەمسیلییەکانی بەرنامەی منداڵان



لە کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکاندا





لە کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکاندا



تۆمارکردنی بەرنامەی منداڵان لە قوتابخانەکان
کە زنجیرەی هەر بەرنامەیەک لەوێدا تۆمار دەکرا



تۆمارکردنی بەرنامەی منداڵان لە قوتابخانەکان





لە کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکاندا



چیرۆکی تەمسیلی بووکی ژێر دەواری ڕەش سالی ١٩٨٥



کردنەوەی پێشانگای هونەری ساڵانە لە چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٦



چیرۆکی تەمسیلی مۆرانە ساڵی ١٩٨٦



بەرنامەی هونەری ساڵی ١٩٩٢



شانۆی قەڵای دم دم ساڵی ١٩٨٤



چیرۆکی تەمسیلی ئاسکە سالی ١٩٨٦



بەرنامە جگەرگۆشەکان هەڵەبجە سالی ١٩٨٣



تۆمارکردنی بەرنامەی منداڵان لە قوتابخانەکان



چیرۆکی تەمسیلی بوکی ژێر دەواری ڕەش ساڵی ١٩٨٥ سلێمانی



۱۰ زنجیرەی تەمسیلی مانگی ڕەمەزان سالی ۱۹۹٥



لە کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکان



له كاتی وێنەگرتنی بەرنامەکان





له کاتی وێنەگرتنی بەرنامەکان





له کاتی وێنەگرتنی تەمسیلییەکان



سوهام محەمەد گۆرانبێژ و ئەکتەر



سوهام محەمەد گۆرانبێژ و ئەکتەر



لە کاتی وێنەگرتنی تەمسیلییەکان



یەکێك لە دراماکانی تەلەفزیۆن



لە کاتی ئارایشتکردنی ئەکتەر لە ستۆدیۆی کەرکوك



لە کاتی وێنەگرتنی تەمسیلییەکان









لە کاتی وێنەگرتنی تەمسیلییەکان



تیپی مۆسیقای سلێمانی



یەکێك لە دراماکانی تەلەفزیۆن



چیرۆکی تەمسیلی ئاسکە سالی ١٩٨٨



چیرۆکی تەمسیلی ئاسکە سالی ١٩٨٨





حەسەن گەرمیانی لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی



هونەرمەند عەلی مەردان لەکاتی گۆرانی گوتن





بەشێك لە گۆرانییەکانی ستۆدیۆی کەرکوك




تیپی مۆسیقای ڕۆژئاوایی



تیپی مۆسیقای سلێمانی، لە کاتی تۆمارکردنی گۆرانی لە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کەرکوک



هونەرمەند سەلاّح داودە



تیپی مۆسیقای سلێمانی، لە کاتی تۆمارکردنی گۆرانی لە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کەرکوك



حەسەن گەرمیانی



کەریم کابان



ئەسعەد قەرەداغی و ئەنوەر قەرەداغی



ناسری ڕەزازی و مەرزییە و ڕەمەزان زامدار و ئیسماعیل گەیلانی



**تیپی مۆسیقای سۆلاڤ لە کەرکوك**



**تیپی مۆسیقای سلێمانی، لە کاتی تۆمارکردنی گۆرانی لە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کەرکوك**





**تیپی مۆسیقای سلێمانی**
**گۆرانی ڕەنگاوڕەنگ**





تیپی مۆسیقای سلێمانی، لە کاتی تۆمارکردنی گۆرانی لە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کەرکوك





تیپی مۆسیقای سلێمانی





**تیپی مۆسیقای سلێمانی، لە کاتی تۆمارکردنی گۆرانی لە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کەرکوك**





تیپی مۆسیقای سلێمانی

**٢- كەناڵی تەلەفزیۆنی كەركوك:-**

**د. بەهادین ئەحمەد**

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق و رزگاركردنی كەركوك لە ساڵی ٢٠٠٣و، دواتر لە ساڵی ٢٠٠٤ لە كۆبونەوەیەكی كادرانی سنووری كەركوك، (مام جەلال) سكرتێری گشتی (ی.ن.ك) بڕیاریدا كەناڵێكی لۆكاڵی تەلەفزیۆن لەسەر چەناڵی (١٠) VHS بەزمانە سەرەكییەكانی كەركوك پەخش بكات.

ڕۆژی (٢٠)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٤) لە ڕێوڕەسمێكی شایستەدا بە ئامادەبوونی لێپرسراوی مەڵبەندی دووی ڕێكخستنی كەركوك و لێپرسراوی مەكتەبی ناوەندی ڕاگەیاندن، لەلایەن پارێزگاری كەركوك، تەلەفزیۆنی كەركوك بەزمانی كوردی و عەرەبی و توركمانی و سریانی دەستی بە پەخش كردنی بەرنامەكانی خۆی كرد.

لە چوارچێوەی گشتییەكەیدا تەلەفزیۆنی كەركوك بەرنامەكانی هەمەڕەنگ بوون.

(سیاسی، كۆمەڵایەتی، هونەری، وەرزشی، زانستی) لەم چوارچێوەیەدا بوو.

١- هەواڵەكان: ڕۆژانە پێنج جار هەواڵی سەرەكی هەبوو بەزمانی كوردی و عەرەبی و توركمانی و كلدو ئاشووری و ئینگلیزی و ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژ: پەیوەندی بەڕووداوە سیاسی و كۆمەڵایەتی و خزمەت گوزارییەكانەوە هەبووە هەروەها لەماوەی پەخشی تەلەفزیۆندا شریتی هەواڵەكان لەزمانی كوردی و عەرەبی و توركمانی و ئینگلیزی دەڕۆیشت.

٢- بەرنامەی (هەڵۆكان) بەرنامەیەك بوو هەر جارەو باس لە ژیاننامەی شەهیدێك دەكرا.

٣- بەرنامەی (تیشك) بەرنامەیەك بوو (١٥) ڕۆژ جارێك ڕاستەوخۆ پێشكەش دەكرا پەیوەندی بە ڕووداوە سیاسییەكانی كەركوك و كوردستان و عێراقەوە هەبووە.

٤- ناوبەناو بەرنامەیەك (دیداری تایبەت) كە پەیوەندی بە ڕووداوێكی گەرمەوە هەبوو پێشكەش دەكرا.

٥- بەرنامەی (پرد) بەرنامەیەكی هەفتانەبوو پەیوەندی بە ڕووداوە سیاسییانەوە هەبووە كە ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر كەركوك و وەزعی سیاسی كوردستان و عێراق هەبووە.

٦- بەرنامەی (دیرۆك) بەرنامەیەكی تۆماركراوبوو (١٥) ڕۆژ جارێك پێشكەش دەكرا، گرنگی ئەدا بە مێژوو و شوێنەوارە مێژووییەكانی كەركوك و دەوروبەری و هاوكات گرنگی ئەدا بە پێگەی ژیان و ڕووناكبیری هاوبەشی نەتەوەكانی كەركوك.

٧- بەرنامەی (ڕات چییە)! بەرنامەیەك بوو (١٥) ڕۆژ جارێك پێشكەش دەكرا، ڕاستەوخۆ لەناو شەقام و گەڕەك و بازارەكان ڕای خەڵكی لەسەر ڕووداوێك یان هەڵوێستێكی سیاسی وەردەگیرا.

٨- بەرنامەی (شەبەنگ): ئەم بەرنامەیە تایبەت بوو بە ژنان (١٥) ڕۆژ جارێك بەتۆمار كراوی پێشكەش دەكرا هەرجارەو لەسەر بابەتێك گفتوگۆ دەكراو بانگێشتی چەند میوانێك دەكرا بۆ ستۆدیۆ.

٩- بەرنامەی (ئۆلۆمپیك) بەرنامەیەكی وەرزشی بوو (١٥) ڕۆژ جارێك لەم بەرنامەیەدا هەموو چالاكییە وەرزشییەكانی ناو شاری كەركوك و دەوروبەری پێشكەش دەكرا پاشان چەند جارێك وەرزشەوانێك بانگێشتی ستۆدیۆ دەكران بینەرانیش دەیانتوانی ڕاستەوخۆ بەشدار ببن و پرسیارو تێبینی خۆیان دەربڕن بەرامبەر میوانەكەو ئەو بابەتەی كە گفتۆگۆی لەبارەوە دەكرا.

١٠- بەرنامەی (میلۆدی) بەرنامەیەكی هونەری بوو (١٥) ڕۆژ جارێك پێشكەش دەكراو هەر جارەو هونەرمەندێك یان چەند هونەرمەندێك بانگێشت دەكران بۆ ستۆدیۆو تیپێكی میوزكی تایبەت بە بەرنامەكەیش هاوكاری هونەرمەندە میوانەكانیان دەكرد، ئەم بەرنامەیە زۆربەی هونەرمەندانی كوردستان و دەرەوەی كوردستانی بەسەر كردووەتەوە.

١١- بەرنامەی (ڕەنج و هیوا) ئەم بەرنامەیە بە تۆماركراوی (١٥) ڕۆژ جارێك پێشكەش دەكرا لەم بەرنامەیەدا هەموو ئەو كەسانەی بەسەر كردووەتەوە كە كەم ئەندام بوون و یاخود بەهرەیەكی تێدا بوو و بەسەر نەكراوەتەوە.

١٢- بەرنامەی (سێبەری ئیسلام) بەرنامەیەكی ئاینی هەفتانە بوو، هەر جارەو لەسەر بابەتێكی ئایینی، ئەو بەرنامەیە پێشكەش دەكرا.

١٣- بەرنامەی (گوزەل سەس) بەرنامەیەكی هونەری توركمانی بوو (١٥) ڕۆژ جارێك بەزمانی توركمانی پێشكەش دەكرا هەر جارەو هونەرمەندێكی توركمان دەبووە میوانی بەرنامەكە تیپێكی میوزیكی تایبەت بە بەرنامە هەبوو.

١٤- بەرنامەی (سەمای پەپوولەكان):

أ-سەمای پەپوولەكان هەفتەی (٣) بەرنامەی تۆماركراوی پێشكەشی دەكرد كە سەردانی باخچەو خوێندگاكانی شاری كەركوك و دەوروبەری دەكرد.

ب- سەمای پەپوولەكان بەرنامەی هەفتانەی ڕاستەوخۆ لەناو ستۆدیۆ پێشكەش دەكراو منالان بە پەیوەندی بەشداری بەرنامەكەیان دەكرد.

١٥- بەرنامەی (تابلۆ) بەرنامەیەكی تۆمار كراوبوو هەفتەی (٣) جار پێشكەش دەكرا تایبەت بوو بەفێربوونی وێنەكێشان بۆ مندالان.

١٦- بەرنامەی (هاتۆچۆ) ئەم بەرنامەیە (١٥) ڕۆژ جارێك ڕاستەوخۆ پێشكەش دەكرا، هەر بەرنامەو میوانێك بۆ ستۆدیۆ بانگێشت دەكرا بۆ گفتۆگۆ كردن لەسەر ڕێنماییەكان و كێشەكانی هاتووچۆ.

١٧- بەرنامەی باڵانس بەرنامەیەكی هەفتانەی ڕاستەوخۆ بوو.

١٨- بەرنامەی ڕەهەندی چوارەم (البعد الرابع) بەرنامەیەكی هەفتانەی تۆماركراوبوو بەزمانی عەرەبی، تیشكی دەخستە سەر ئەو بابەتە گرنگانەی تایبەت بوون بە كوردو كوردستان كە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا بڵاودەكرانەوە.

١٩- بەرنامەی (كەلتوورو جیاوازی) بەرنامەیەكی فیكری و ئەدەبی بوو (١٥) ڕۆژ جارێك تۆمار دەكراو هەر جارەو لەسەر بابەتێك لەگەڵ نوسەرێك یان ڕەخنەگرێك چاوپێكەوتن و گفتۆگۆ دەكرا.

٢٠- بەرنامەی (هەنبانە) بەرنامەیەكی پێشبڕكێی تۆماركراوبوو (١٥) ڕۆژ جارێك پێشكەش دەكرا هەر جارەو

سێ گرووپ بانگێشتی ستۆدیۆ دەكران و پرسیار ئاراستەی گرووپەكان دەكرا.

٢١- بەرنامەی (گەشتی ژیانم) بەرنامەیەكی تۆماركراوبوو، مانگی جارێك پێشكەش دەكرا لەم بەرنامەیەدا هەر جارەو كەسایەتیەكی شاری كەركوكی بەسەر دەكردەوەو باس لەژیانی ئەو كەسە دەكرا.

٢٢- بەرنامەی (ژیانی لادێ) بەرنامەیەكی تۆماركراوبوو (١٥) رۆژ جارێك پێشكەش دەكرا باسی ژیانی لادێی دەكرد.

٢٣- بەرنامەی (كتێب و دیالۆگ) بەرنامەیەكی تۆماركراوبوو (١٥) رۆژ جارێك پێشكەش دەكرا هەر جارەو باس لە كتێبێك دەكرا پاشان چاوپێكەوتن لەگەڵ نووسەرەكەیدا دەكرا.

٢٤- مقال الیوم: هەموو شەوێك بۆ ماوەی (١٠) خولەك بابەتێكی گەرمی رۆژنامەكان پێشكەش دەكرا.

٢٥- بەرنامەی (نێرگز) هەفتەی جارێك راستەوخۆ پێشكەش دەكرا ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەكی تەرفیهی بوو هەر جارەو پرسیارێك ئاراستەی بینەر دەكرا لە كۆتایی بەرنامەكەدا تیروپشك بۆ ئەو كەسانە دەكران كە وەڵامی راستیان لەناو بەرنامەكەدا دابۆوە.

٢٦- بەرنامەی گزنگ بەرنامەیەكی هونەری تۆماركراوبوو (١٥) رۆژ جارێك پێشكەش دەكرا، هەموو چالاكیە هونەرییەكان لەو بەرنامەیەدا پێشكەش دەكرا.

٢٧- بەرنامەی (تەندروستی بۆ هەمووان) ئەو بەرنامەیە بەرنامەیەكی راستەوخۆ پێشكەش دەكرا هەر جارەو پزیشكێك بانگهێشی ستۆدیۆ دەكرا هاووڵاتیانیش بە پەیوەندی پرسیارەكانیان ئاراستەی پزیشكی پسپۆڕیان دەكرد.

٢٨- بەرنامەی (هەر جارەی گەرەكێ) ئەم بەرنامەیە هەر جارەو باس لە مێژووی گەرەكێكی ناو شاری كەركوك دەكرد.

٢٩- بەرنامەی (سەكۆی ئازاد) ئەم بەرنامەیە هەر جارەو باسێكی ناو كۆمەڵگەی دەهێنایە ئاراوەو كۆمەڵێك كەس وەكو سەكۆیەكی ئازاد تاوتوێیان دەكرد.

*** بەشەكانی كەناڵی ئاسمانی كەركوك:**

ئەم كەناڵە لە ٣ی ئەیلوولی ساڵی ٢٠١١ دامەزراوە كە یەكە و بەشەكانی بەم شێوەیەیە:-

١- بەشی كارگێری: پێكدێت لەم یەكانە: (خۆیەتی، شۆفێران، گەنجینە، خزمەتگوزارییەكان، پرسگەو بەداڵە)

٢- بەشی تەكنیك: پێكدێت لەم یەكانە: ( ئەپلێنگ، IT، رسیف، موەلیدەو كارەبا، تەكنیك ستۆدیۆ، SNG، وەرشە)

٣- بەشی هەواڵ: پێكدێت لەم یەكانە: (ئەرشیف و مۆنتاژی هەواڵ، وەرگێران، پەیامێران)

٤- بەشی هونەری: پێكدێت لەم یەكانە: (مۆنتاژ، كامێرا، ئیناره، كۆنترۆڵی ستۆدیۆی هەواڵ: ستۆدیۆی دەنگ و دۆبلاژ، MCR ، گرافیك)

٥- بەشی پەیوەندییەكان: پێكدێت لەم یەكانە: (ئاگاداری، ریكلام، كوافێر)

٦- بەشی بەرنامە: پێكدێت لەم یەكانە: (ئەرشیف، تەنسیق، دیكۆر، منداڵان، دیكۆمێنت)

٧- بەشی ژمێریاری.

٨- بەشی سایتی كەركوكTV: بە هەردوو زمانی (كوردی و عەرەبی) هەواڵ و راپۆرت و رووداوەكانی رۆژانە بڵاو دەكاتەوە.

*** بەڕێوەبەرەكانی كەناڵی ئاسمانی كەركوك**

- عارف قوربانی
- نزار خەسرەو
- رزگار حاجی حەمە
- دڵێر مامۆستا قادر

**٣. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (بابا گوڕگوڕ):**

**٤. كەناڵی ئاسمانی (توركمن ئیلی):**

**٥. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (ئازادی):**

**٦. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (توركمن یۆڵ):**

**٧. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (نوور):**

**٨. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (النبأ):**

**٩. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (U.TV)یەكگرتوو:**

**١٠. تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (كەركوك سپۆرت):**

**١١ تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (العراقیة):**

**١٢. تەلەفزیۆنە ناوخۆییەكانی كەلار:**

دەزگا حیزبی جۆراوجۆرەكان، لەم شارەدا كەوتنە كاركردن لە رێگای دەزگای پەخشی سەتەلایتەوە بەرنامەی تایبەتیان پەخش دەكرد، بۆ زیاتر ئاشنابوون بە دەنگ و باسەكانی جیهان، ئەمە هەنگاوێكی باش بوو بۆ خەڵك و لەم رێگایەوە سودێكی باشیان وەردەگردت، ئەو تەلەفزیۆنانەش ئەمانەن:

پەخشی تەلەفزیۆنی كەلار لە رۆژی (١٩)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٧) لەلایەن راگەیاندنی كۆمیتەی كەلاری (یەكێتی نیشتمانی كوردستان) دامەزراو دوای ئەوەی كە پەخشی كوردستان دەستی پێ كرد هەڵگیرا، هەروەها پەخشی تەلەفزیۆنی ئازادی لەلایەن لیژنەی كەلاری حیزبی شیوعییەوە لە (١)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٠)دا دامەزرا[١].

**١٣- تەلەفزیۆنی ناوخۆیی ئاینده لە كەلار**
**١٤- تەلەفزیۆنی ناوخۆیی كۆمەڵ لە گەرمیان**
**١٥- تەلەفزیۆنی (U.sport)ی یەكگرتوو**
**١٦- تەلەفزیۆنی سپێدەی ناوخۆیی**
**١٧- تەلەفزیۆنی چرا**
**١٨- تەلەفزیۆنی (U.Kids)ی یەكگرتوو**
**١٩- تەلەفزیۆنی (U.Document)ی یەكگرتوو**

*** رادیۆ ناوخۆییەكان:**

**١- رادیۆی یەكگرتوو لە چەمچەماڵ**

٢- ڕادیۆی دەنگی کۆمەڵ لە کەلار
٣- ڕادیۆی دەنگ لە کەلار
٤- ڕادیۆی دەنگی کوردستانی پارتی دیموکراتی کوردستان
٥- ڕادیۆی میلان ئێف ئێم
٦- ڕادیۆی کەرکوك FM
٧- ڕادیۆی یەکگرتوو:-

**دەنگی یەکگرتوو - ڕادیۆی کەرکوك:**

١. لە (١١)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) لەسەر شەپۆلی (FM) بە فریکیۆنسی (MHZ ١٠٥,٥) دامەزراوە، لە سەرەتادا (٣٠٠) واتی بووەو پاشان بۆ (١٣٠٠) واتی گۆڕدراوە، لە ئێستادا لە دوو کاتی بەیانیان سەعات (٧:٣٠ - ١٢)و دوانیوەڕوان لە (٣:٥٠ - ٥)ی ئێوارە پەخشی بەرنامەکانی بە هەر سێ زمانی کوردی (زاراوەی کرمانجی خواروو (سۆرانی)و عەرەبیو تورکمانی) دەکات.

٢. پەخشەکەی کەرکوکو دەوروبەری بە چەمچەماڵو پردێو داقوقەوە دەگرێتەوەو ڕۆژانە یەك گەشتی هەواڵو کورتەیەکی هەیە.

٣. بەڕێوەبەرکەی (م .تالیب محەمەد ساڵح)ەو (١٢) کارمەندیشی هەیە (٦) پیاو و (٦) ئافرەت.

٤. خشتەی بەرنامەو ئامادەو پێشکەشکارانی ئێستای:

| ز | بەرنامەکان | ئامادەو پێشکەشکار | هەفتانەو ڕۆژان - ڕاستەوخۆو ناڕاستەخۆ | ناوەڕۆك |
|---|---|---|---|---|
| ١ | پڕشنگی بەیان | م. تالیب محەمەد | ڕۆژانە | (٧) ساڵەو نزیك بە (٢٠٠٠) ئەڵقەی لێ پێشکەشکراوە |
| ٢ | چرا | پەروین نەجم | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | خۆشکان |
| ٣ | تریفەی شیعرو ئەدەب | نیزام ساڵح | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | ئەدەب |
| ٤ | بەڵێنو پەیمان | بەناز عەبدولسەلام | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | پەروەردەیی |
| ٥ | لە ڕوانگەی شەرعەوە | هەنا محەمەد | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | میوانداری مامۆستایان |
| ٦ | پەروەردەی دەروون | جەعفەر ئەحمەد غەفور | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | تەزکیە |
| ٧ | ژیانی پێغەمبەران | م. مەریەم مەحمود | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | |
| ٨ | ڕیپۆرتاژ | بێستون شەریف | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | |
| ٩ | بێ مانان دێنە زمان | ساجیدە عەبدولسەلام قەرەداغی | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | سیرە |
| ١٠ | دەرگای ڕەیان | م. مەریەم مەحمود | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | پەروەردەییو ئیمانیی |
| ١١ | جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز | پەروین نەجم | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | |
| ١٢ | خەڵاتی ئاسمان | نێرگز رزگار | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | خوێندنەوەی قورئان |
| ١٣ | گەشتێك بەناو سایتە جیهانییەکاندا | بێستون شەریف | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | |
| ١٤ | هونەرو دیاریی | سۆران، محەمەد تۆفیق | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | هونەریی |
| ١٥ | پێشبڕکێ | لەیلا فائیقو چەند کەسێکی دیکە | هەفتانە - ڕاستەوخۆ | |
| ١٦ | وتای هەینی | هەرچارەو مامۆستایەك | تۆمارکراو | |
| ١٧ | ئیمانو ژیان | حاجی کاروان | هەفتانە - تۆمارکراو | |
| ١٨ | بەندایەتی | م. شوکر | هەفتانە - تۆمارکراو | |
| ١٩ | لە سایەی قورئان | م. قاسم گەلاڵی | هەفتانە - تۆمارکراو | |
| ٢٠ | گۆشەی چیرۆكو پەخشان | نێرکز رزگار | هەفتانە - تۆمارکراو | |

بەرنامەکانی بەشی عەرەبی و تورکمانی:
- (همس الاحبة)، ڕاستەوخۆ.
- (جاوب واربح)، ڕاستەوخۆ.
- (محاضرات)، تۆمارکراو.
لەگەڵ چەند بەرنامەیەکی دیکەی عەرەبیدا.
- (إسلام تانسن)، شێخ فایق، تورکمانی، ڕاستەوخۆ.
لەگەڵ چەند بەنامەیەکی دیکەی تورکمانیدا.
سەرجەم (٤٩) بەرنامەی بە هەر سێ زمانی (کوردیو عەرەبیو تورکمانی) هەیەو (٢٨)یان ڕاستەوخۆنو (٢١) یشیان ناڕاستەوخۆ

* بەشێك لە ڕادیۆکانی کەرکوك و دەوروبەری:-
١- ڕادیۆی ئاشتی
٢- ڕادیۆی الرشید
٣- ڕادیۆی لەن
٤- ڕادیۆی میلان
٥- ڕادیۆی کۆمەڵی ئیسلامی
٦- ڕادیۆی ئازادی
٧- ڕادیۆی باوەگورگور
٨- ڕادیۆی دەنگی کوردستان
٩- ڕادیۆی تورکمان ئیلی
١٠- ڕادیۆی النبأ - کەناڵ
١١- ڕادیۆی سەردەم
١٢- ڕادیۆی سیما
١٣- ڕادیۆی القرآن الکریم
١٤- ڕادیۆی مەڵبەند
١٥- ڕادیۆی زەحمەتکێشان
١٦- ڕادیۆی سۆسیالیست
١٧- ڕادیۆی ئەوقاف
١٨- ڕادیۆی ئێستا
١٩- ڕادیۆی گۆران
٢٠- ڕادیۆی دەنگی شەریعەت

* خشتەی هەندێك لە ڕادیۆکانی سنووری پارێزگای کەرکوك؛

| ز | ناوی ڕادیۆ | شوێن | فریکوێنسی | لایەن |
|---|---|---|---|---|
| ١ | دەنگی کۆمەڵ | کەرکوك | ١٠١ | کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان |
| ٢ | دەنگی قورئانی پیرۆز | کەرکوك | ١٠٧ | کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان |
| ٣ | دەنگی یەکگرتوو | کەرکوك | ١٠٥,٥ | یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان |
| ٤ | ڕادیۆی کەرکوك | کەرکوك | | یەکێتی نیشتمانی کوردستان |
| ٥ | ڕادیۆی بابە گوڕگوڕ | کەرکوك | | پارتی دیموکراتی کوردستان |
| ٦ | ڕادیۆ سەردەم | کەرکوك | | بزوتنەوەی دیموکراتیخوازان |
| ٧ | ڕادیۆی ئازادی | کەرکوك | | حیزبی شیوعی کوردستان |
| ٨ | ڕادیۆی وڵات | کەرکوك | | |
| ٩ | ڕادیۆی ئاشتی | کەرکوك | | |
| ١٠ | ڕادیۆی برایەتی | کەرکوك | | حیزبی ئیسلامی عێراقی |
| ١١ | ڕادیۆی جەماوەر | کەرکوك | | حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان |
| ١٢ | ڕادیۆی لاوان | کەرکوك | | |
| ١٣ | ڕادیۆی دەنگی کوردستان | کەرکوك | ١٠٢,٦ | پارتی دیموکراتی کوردستان |
| ١٤ | ڕادیۆی کەرکوك FM | کەرکوك | ٩٣,٣ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان |

*** خشتەی ڕادیۆکانی سنووری کفری و کەلارو چەمچەماڵ:**

| ز | ناوی ڕادیۆ | شوێن | ژمارەی شەپۆڵ | لایەنی بەرپرس |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕادیۆی قورئانی پیرۆز | چەمچەماڵ | ٩٢ | کۆمەڵی ئیسلامیی |
| ٢ | دەنگی کۆمەڵ | چەمچەماڵ | ١٠٥ | کۆمەڵی ئیسلامی |
| ٣ | ڕادیۆی نەوا - مەرکەزی | کەلار | ٩١ | کوردە حەسەن |
| ٤ | ڕادیۆی جەماوەر - مەرکەزی | گەرمیان | ٨٩,٩ | حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان |
| | | کەرکوك | ٩٢ | |
| | | چەمچەماڵ | | |
| | | خورماتوو | | |
| ٥ | ڕادیۆی پەیامی قورئان | کەلار | ١٠٣ | کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان |
| ٦ | دەنگی یەکگرتوو | گەرمیان | ٨٩,٩ | یەکگرتووی ئیسلامیی، لە (٢٢)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٧) دەستی پێکردووە |
| | | کفری | ١٠٣,٤ | |
| ٧ | دەنگی کۆمەڵ | گەرمیان | ٨٧,٧ | کۆمەڵی ئیسلامیی |
| ٨ | ڕادیۆی ئازادی | کەلار | ١٢٥٠ | حیزبی شیوعی لقی کەلارەوە سەرپەرشتی دەکرێت بە زمانی عەرەبی و کوردی، لە (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٥) دەستی پێکردووە |
| | | چەمچەماڵ | ١٢٥٠ | |
| ٩ | دەنگی گەرمیان | کەلار | | کۆمیتەی کەلاری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) دەستی پێکردووە |

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. (مێژووی کەلار)، سوارە حەسەن باجەڵان، چاپخانەی (چوارچرا)، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە (١٣٧).

*** ڕادیۆیەکی تایبەت بە نابینایان:-**

هەڤاڵ ئیسماعیل کە تەمەنی ٤٢ ساڵە، دانیشتووی کەلارە لە ماڵەکەی خۆیدا ڕادیۆیەکی کردووەتەوە، پەخشی ڕادیۆکە تا سنووری خانەقین و دەربەندیخان دەچێت، سەرەتا پەخشەکەی تا سنووری (باوەنوور) دەڕۆیشت، وە چەند خێرخوازێك هاوکارییان کردووە، سێ کارمەندی نابینانی لەگەڵدا بوو، بە ئامیری سادە کارەکانی ئەنجام دەدا.
بەرنامەی ڕادیۆکە بابەتی: زانستی، مێژوویی، ئایینی، پەروەدەیی بووە.

سەرچاوە:-
- هاووڵاتی ژ(١٨٠٩) لاپەڕە (٨) لە ٢٩ی مایسی ٢٠١٩.

# پێرست

## * بیلۆگرافیای ڕاگەیاندن لە دەڤەری کەرکوك

* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە لەنێوان سالانی ١٨١٣-١٩٥٩..........٥-١٢
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٦٠..........١٣
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٦١..........١٤
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٦٢..........١٥
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی باخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٦٣- ١٩٦٤..........١٦-١٨
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٦٥- ١٩٦٩)..........١٩-٢٠
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٧٠- ١٩٧٢..........٢١-٢٤
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٧٣- ١٩٧٩..........٢٥-٢٨
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٨٠- ١٩٨٩..........٢٩-٣٥
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ١٩٩٠- ١٩٩٩..........٣٦-٤٦
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٠..........٤٧-٥٠
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠١..........٥١-٥٤
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٢..........٥٥-٥٩
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٣..........٦٠-٦٤
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٤..........٦٥-٧٠
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٥..........٧١-٨٠
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٦..........٨١-٨٨
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٧..........٨٩-٩٩
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٨..........١٠٠-١١٦
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠٠٩..........١١٧-١٣٥
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٠..........١٣٦-١٤٨
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١١..........١٤٩-١٦٢
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٢..........١٦٣-١٧٨
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٣..........١٧٩-٢٠٩
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٤..........٢٠٩-٢١٩
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٥..........٢٢٠-٢٢٦
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٦..........٢٢٧-٢٣١
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە کە سالی لەچاپدانیان تۆمار نەکراوە.....٢٣٢-٢٣٤
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە سالی ٢٠١٧..........٢٣٥-٢٣٧

* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوەساڵی ٢٠١٨ ..... ٢٣٨-٢٤٣
* بیبلۆگرافیای ئەو کتێبانەی بایەخیان بە کەرکوك داوە ساڵی ٢٠١٩-٢٠٢٠ ..... ٢٤٤-٢٥٠
* ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی لە کەرکوکدا سەریان هەڵداوە لەنێوان ساڵانی ١٩٠٨- ٢٠١٩ ..... ٢٥١-٤٢٠
* دارێك لە باباگوڕگوڕ ڕواو بوو بە دارە مازوو ..... ٤٢١-٤٢٤
- بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنووسی کوردی لە کەلار (١٩٩١- ٢٠١١) ..... ٤٢٥-٤٢٦
١- میلکان ..... ٤٢٦
٢- پەیامی ئازادی ..... ٤٢٦
٣- تیشك ..... ٤٢٦
٤- وەرزش و گرمیان ..... ٤٢٦
٥- کەڵیار ..... ٤٢٦-٤٢٧
٦- گۆڤار ..... ٤٢٧
٧- توێژەر ..... ٤٢٧
٨- پزیشکی نوێ ..... ٤٢٧
٩- سۆز ..... ٤٢٧
١٠- پێنووس (پێنوس) ..... ٤٢٧
١١- گەرمیان ..... ٤٢٧-٤٢٨
١٢- پەیامی لاوان (پەیامی گەنج) ..... ٤٢٨
١٣- کەلار ..... ٤٢٨
١٤- بەرەوشار ..... ٤٢٨
١٥- هەنگاو ..... ٤٢٨
١٦- هەشتاو هەشت ..... ٤٢٨-٤٢٩
١٧- ئەفراندن ..... ٤٢٩
١٨- خەڵك ..... ٤٢٩
١٩- کەنار ..... ٤٢٩
٢٠- داینەمۆ ..... ٤٢٩-٤٣٠
٢١- شکۆفە ..... ٤٣٠
٢٢- ژیپان ..... ٤٣٠
٢٣- شێروانە ..... ٤٣٠
٢٤- پەیامی خوێندکار ..... ٤٣٠
٢٥- کۆست ..... ٤٣٠
٢٦- ئایندەی گەرمیان ..... ٤٣٠-٤٣١
٢٧- گەرمیان وەرزشی ..... ٤٣١
٢٨- خوێندنی نوێ ..... ٤٣١
٢٩- گۆڤاری گیرفان ..... ٤٣١
٣٠- نەسیم ..... ٤٣١
٣١- وەرزشکاران ..... ٤٣١
٣٢- مودەریس ..... ٤٣١-٤٣٢
٣٣- ئاتییە ..... ٤٣٢
٣٤- شێخ لەنگەر (سۆراخ) ..... ٤٣٢
٣٥- گەرمیان ئەمڕۆ ..... ٤٣٢
٣٦- چرای باوەنوور (چرا) ..... ٤٣٢-٤٣٣
٣٧- کوردەمیر ..... ٤٣٣
٣٨- بارین ..... ٤٣٣
٣٩- رازی گەنج ..... ٤٣٣
٤٠- ڕوانگە ..... ٤٣٣
٤١- کەلاری ..... ٤٣٣
٤٢- هاوبەش ..... ٤٣٣
٤٣- چاو ..... ٤٣٣-٤٣٤

٤٤- راسال ........................ ٤٣٤
٤٥- بانە ڕۆژ ........................ ٤٣٤
٤٦- تەما ........................ ٤٣٤
٤٧- ناسنامە ........................ ٤٣٤
٤٨- تراژیدیا ........................ ٤٣٤
٤٩- کۆنفرانس گەرمیان ........................ ٤٣٤-٤٣٥
٥٠- گەرمیان پۆست ........................ ٤٣٥
٥١- سروشت ........................ ٤٣٥
٥٢- هەفتانەی بەمۆ ........................ ٤٣٥
٥٣- هەتاو ........................ ٤٣٥
٥٤- ڕووناکی ........................ ٤٣٥
٥٥- داری خلە ........................ ٤٣٥
٥٦- داکۆکی ........................ ٤٣٥
٥٧- مەودا ........................ ٤٣٥
٥٨- زانست ........................ ٤٣٦
٥٩- هاتوچۆ ........................ ٤٣٦
٦٠- لاو ........................ ٤٣٦
٦١- نانۆ ڕیکلام ........................ ٤٣٦
* لیستی بڵاوکراوەکانی شاری کەلار لەنێوان (١٩٩١-٢٠١١)دا ........................ ٤٣٧-٤٣٨
* مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی لە خورماتوو........................ ٤٣٩-٤٤٣
* پێداچوونەوە بە ئەزموونی ڕۆژنامەگەری کەرکوك ........................ ٤٤٤-٤٤٦
- کەیسی کەرکوك سیاسییە ........................ ٤٤٤
- ڕۆژنامەگەری سیاسی لە کەرکوك کەم بایەخ بووە ........................ ٤٤٤
- زمانی کۆکەرەوەی ڕۆژنامەگەری ........................ ٤٤٥-٤٤٦
- زمانێکی کۆکەرەوە نییە ........................ ٤٤٦
- خەسڵەتی (سۆشیالیستی) ........................ ٤٤٦
- ناوەندیی ڕۆژنامەوانیی کەرکوك ........................ ٤٤٦

* چاپخانەو بەرهەمە چاپکراوەکانی کەرکوك ........................ ٤٤٨-٤٦١
١- چاپخانەی (الولایة) ........................ ٤٤٨
٢- چاپخانەی (الصنائع) ........................ ٤٤٩
٣- چاپخانەی (الحوادث) ........................ ٤٤٩-٤٥٠
٤-چاپخانەی (شارەوانی) ........................ ٤٥٠-٤٥١
٥- چاپخانەی (نەینەوا) ........................ ٤٥١
٦- چاپخانەی (تەتویج - کەرکوك) ........................ ٤٥١
٧- چاپخانەی (بەشیر - تەرەقی) ........................ ٤٥١
٨- چاپخانەی (هیلال) ........................ ٤٥٢
٩- چاپخانەی (شیمال) ........................ ٤٥٢-٤٥٣
١٠- چاپخانەی (التجاریة) ........................ ٤٥٣
١١- چاپخانەی (الجمهوریة) ........................ ٤٥٣-٤٥٤
١٢- چاپخانەی (تیمارە) ........................ ٤٥٤
١٣- چاپخانەی ئۆفسێتی (الذهب الاسود) ........................ ٤٥٤
١٤- چاپخانەی ئۆفسێتی (شارەوانی) ........................ ٤٥٤
١٥- چاپخانەی (قاسم) ........................ ٤٥٤
١٦- چاپخانەی (مەرجان) ........................ ٤٥٤
١٧- چاپخانەی (الجوهرە) ........................ ٤٥٤
١٨- چاپخانەی (القادسیة) ........................ ٤٥٤
١٩- چاپخانەی (المصطفی) ........................ ٤٥٤

٢٠- چاپخانەی (الاصیل) ..... ٤٥٤
٢١- چاپخانەی (صلاح) ..... ٤٥٤
٢٢- چاپخانەی (حنان) ..... ٤٥٤
٢٣- چاپخانەی (الضحی) ..... ٤٥٥
٢٤- چاپخانەی ئۆفیسێتی (ئاسیا) ..... ٤٥٥
٢٥- چاپخانەی (المعرفة) ..... ٤٥٥
٢٦- چاپخانەی (ئەراپخا) ..... ٤٥٥
٢٧- چاپخانەی (شەهید ئازاد هەورامی) ..... ٤٥٥-٤٥٦
٢٨- چاپخانەی (ڕۆژ) ..... ٤٥٦-٤٦١

* مێژووی كتێبخانەو كتێب فرۆشەكانی كەركوك ..... ٤٦٢
- كۆنترین كتێبخانە لە (نوزی) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەكانی ناو شاری كەركوك ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (حاجی سلێمان ئاغا) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (دەدە شاقولی) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (شاە غازی) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (حاجی فەتاح) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (قەلا) ..... ٤٦٣
- كتێبخانەی (الامل) ..... ٤٦٣-٤٦٤
- كتێبخانەی (الفارابي) ..... ٤٦٤
- كتێبخانەی (العصري) ..... ٤٦٤
- كتێبخانەی (الترقي) ..... ٤٦٤
- كتێبخانەی (فكري) ..... ٤٦٤
- كتێبخانەی (الاخوة الاسلامیة) ..... ٤٦٤
- كتێبخانەی (مەلا مستەفا) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (عەباس حلمی) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (حەبیب) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (عصریە) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (مەدەرسەی مەحمودی خاڵ) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (مەدەرسەی مەهرانی) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (مەدەرسەی سوڵتانیە) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی خانەقای عومەر گونبەدی) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (المثنی) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (حیزبی شیوعی) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (فیكرت جاوید) ..... ٤٦٥
- كتێبخانەی (عومەر بێكەس) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (حەمید پاتاسی) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (مەلا خالید سەیوسیتانی) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (مەلا خالید كچانی) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (محەمەد حوسێن) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (مەلا ئەورەحمان) ..... ٤٦٦
- كۆگای (گەلاوێژ) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (هەندرێن) ..... ٤٦٦
- كتێبخانەی (ئاسۆ) ..... ٤٦٦-٤٦٧
- كتێبخانەی گەل ..... ٤٦٧
- كتێبخانەی (مەلا ڕەشید زەنگەنە) ..... ٤٦٧
- كتێبخانەی (حاجی لەتیف) ..... ٤٦٧

- کتێبخانەی (مەلا ئەمینی شۆڕێچە) ٤٦٧
- کتێبخانەی (فەهمی دەروێش) ٤٦٧
- کتێبخانەی (السلام) ٤٦٧
- کتێبخانەی (الاندلس) ٤٦٧
- کتێبخانەی (الامل) ٤٦٧
- کتێبخانەی (ئازادی) ٤٦٧
- کتێبخانەی (الجامعە) ٤٦٧
- کتێبخانەی (دارا) ٤٦٧
- کتێبخانەی (التاخی) ٤٦٧
- کتێبخانەی (الجماهیر) ٤٦٧
- کتێبخانەی (ئەمین) ٤٦٧-٤٦٨
- کتێبخانەی (الأمل) ٤٦٨
- کتێبخانەی (ئاسیا) ٤٦٨
- کتێبخانەی (الجمهوریة) ٤٦٨
- کتێبخانەی (الفارابی) ٤٦٨
- کتێبخانەی (فیدان) ٤٦٨
- کتێبخانەی (عەبدوڵلا زەنگنە) ٤٦٨
- کتێبخانەی (دار الوطنیة) ٤٦٨
- کتێبخانەی (غەمگین) ٤٦٨
- کتێبخانەی (محمد خضر) ٤٦٨
- کتێبخانەی (رێگا) ٤٦٩
- کتێبخانەی (محەمەد) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الفلسطینیة) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الجمهوریة) ٤٦٩
- کتێبخانەی (یەلماز عوسمان) ٤٦٩
- کتێبخانەی (کەرکوك) ٤٦٩
- کتێبخانەی (عەرەفە) ٤٦٩
- کتێبخانەی (جمیلە بوحیرد) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الثورة) ٤٦٩
- کتێبخانەی (غازی فکری) ٤٦٩
- کتێبخانەی (ارزوقی) ٤٦٩
- کتێبخانەی (عەلی واخوانە) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الهلال) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الطلائع) ٤٦٩
- کتێبخانەی (ابو ناظم العبیدی) ٤٦٩
- کتێبخانەی (التامیم) ٤٦٩
- کتێبخانەی (الکوثر) ٤٦٩
- کتێبخانەی (تبارك) ٤٧٠
- کتێبخانەی (سوبحی عەلی) ٤٧٠
- کتێبخانەی (حوسێن عەلی غالب) ٤٧٠
- کتێبخانەی (دار القراء) ٤٧٠
- کتێبخانەی (المتنبی) ٤٧٠
- کتێبخانەی (سەلاح بەهلول عەلی) ٤٧٠
- کتێبخانەی (سامی حەبیب مەیاس) ٤٧٠
- کتێبخانەی (الطالب) ٤٧٠
- کتێبخانەی (ئەسیری) ٤٧٠
- کتێبخانەی (کەرکوك) ٤٧٠
- کتێبخانەی (عەلی مەردان) ٤٧٠

– کتێبخانەی (ڕۆژ) ........ ٤٧٠
– کتێبخانەی (ژووانی نووسەران) ........ ٤٧٠
– کتێبخانەی (مەترانییەی کەرکوک) ........ ٤٧٠
– کتێبخانەی (گشتی کەرکوک) ........ ٤٧٠-٤٧١
– هەندێك لەبەرێوەبەرەکانی کتێبخانەی گشتی کەرکوک ........ ٤٧٢-٤٧٣
– کتێبخانەی (گشتی کفری) ........ ٤٧٣
– کتێبخانەی (گشتی چەمچەماڵ) ........ ٤٧٣
– کتێبخانەی (گشتی کەلار) ........ ٤٧٣
– کتێبخانەی (گشتی قەرەهەنجیر) ........ ٤٧٣
– کتێبخانەی (گشتی سەر قەلاّ) ........ ٤٧٣
– کتێبخانەی (کارێز) ........ ٤٧٣-٤٧٥
– تاریق کارێزی کێیە؟ ........ ٤٧٤
– کتێب و نامیلکەکان ........ ٤٧٤-٤٧٥
– ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی بۆ دیالۆگ ........ ٤٧٥
– کتێبخانەکانی (تێگرتنی بەرگ – جزوبەند) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (مکتب الفن الحدیث) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (سەلاّح) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (ئەهرام) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (فارابی) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (سەلاّح) ........ ٤٧٥
– کتێبخانەی (بدائع الفن) ........ ٤٧٥-٤٧٦
– کتێبخانەی (سەمیر) ........ ٤٧٦
– سەرچاوەکان ........ ٤٧٦

* مێژووی کەناڵە ئاسمانی و تەلەفیزیۆنە ناوخۆییەکانی کەرکوک ........ ٤٧٧
١– مێژووی تەلەفزیۆنی کەرکوک ........ ٤٧٧-٥٣٣
٢– کەناڵی تەلەفزیۆنی کەرکوک ........ ٥٣٣-٥٣٦
٣– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (باباگوڕ گوڕ) ........ ٥٣٦
٤– تەلەفیزیۆنی ئاسمانی (تورکمن ئیلی) ........ ٥٣٦
٥– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (ئازادی) ........ ٥٣٦
٦– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (تورکمن یوڵ) ........ ٥٣٦
٧– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (نوور) ........ ٥٣٦
٨– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (النبا) ........ ٥٣٦
٩– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (U. TV) یەکگرتوو ........ ٥٣٦
١٠– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (کەرکوک سپۆرت) ........ ٥٣٦
١١– تەلەفیزیۆنی ناوخۆیی (العراقیە) ........ ٥٣٦
١٢– تەلەفیزیۆنە ناوخۆییەکانی کەلار ........ ٥٣٦
١٣– تەلەفزیۆنی ناوخۆیی ئایندە لە کەلار ........ ٥٣٦
١٤– تەلەفزیۆنی ناوخۆیی کۆمەڵ لە گەرمیان ........ ٥٣٦
١٥– تەلەفزیۆنی (U. sport)ی یەکگرتوو ........ ٥٣٦
١٦– تەلەفزیۆنی سپێدەی ناوخۆیی ........ ٥٣٦
١٧– تەلەفزیۆنی چرا ........ ٥٣٦
١٨– تەلەفزیۆنی (U. Kids)ی یەکگرتوو ........ ٥٣٦
١٩– تەلەفزیۆنی (U. Document)ی یەکگرتوو ........ ٥٣٦
* ڕادیۆ ناوخۆییەکان ........ ٥٣٦
١– ڕادیۆی یەکگرتوو لە چەمچەماڵ ........ ٥٣٦
٢– ڕادیوی دەنگی کۆمەڵ لە کەلار ........ ٥٣٦
٣– ڕادیۆی دەنگ لە کەلار ........ ٥٣٦

٤- ڕادیۆی دەنگی کوردستانی پارتی دیموکراتی کوردستان ........ ٥٣٦
٥- ڕادیۆی میلان ئێف ئێم ........ ٥٣٦
٦- ڕادیۆی کەرکوك FM ........ ٥٣٦
٧- ڕادیۆی یەکگرتوو ........ ٥٣٦
* دەنگی یەکگرتوو - ڕادیۆی کەرکوك ........ ٥٣٧
* ناوی بەشێك لە ڕادیۆکانی کەرکوك و دەوروبەری ........ ٥٣٨
١- ڕادیۆی ئاشتی ........ ٥٣٨
٢- ڕادیۆی الرشید ........ ٥٣٨
٣- ڕادیۆی لەن ........ ٥٣٨
٤- ڕادیۆی میلان ........ ٥٣٨
٥- ڕایۆی کۆمەڵی ئیسلامی ........ ٥٣٨
٦- ڕدایۆی ئازادی ........ ٥٣٨
٧- ڕادیۆی باوەگوڕ گوڕ ........ ٥٣٨
٨- ڕادیۆی دەنگی کوردستان ........ ٥٣٨
٩- ڕادیۆی تورکمان ئیلی ........ ٥٣٨
١٠- ڕادیۆی النبا - کەناڵ ........ ٥٣٨
١١- ڕادیۆی سەردەم ........ ٥٣٨
١٢- ڕادیۆی سیما ........ ٥٣٨
١٣- ڕادیۆی القرآن الکریم ........ ٥٣٨
١٤- ڕادیۆی مەڵبەند ........ ٥٣٨
١٥- ڕادیۆی زەحمەتکێشان ........ ٥٣٨
١٦- ڕادیۆی سۆسیالیست ........ ٥٣٨
١٧- ڕادیۆی ئەوقاف ........ ٥٣٨
١٨- ڕادیۆی ئێستا ........ ٥٣٨
١٩- ڕادیۆی گۆڕان ........ ٥٣٨
٢٠- ڕادیۆی دەنگی شەریعەت ........ ٥٣٨
* خشتەی هەندێك لە ڕادیۆکانی سنووری پارێزگای کەرکوك ........ ٥٣٨
* خشتەی هەندێك لە ڕادیۆکانی سنووری کفری و کەلار و چەمچەماڵ ........ ٥٣٩
* سەرچاوەو پەراوێزەکان ........ ٥٣٩
* ڕادیۆیەکی تایبەت بە نابینایان ........ ٥٤٠

* پێرست ........ ٥٤١-٥٤٧

لەو داهێنانە بەرچاوانەی کە بۆمان بە جێ ماوەو بەشێکی گرنگی شارستانییەتی هوری - میتانییەکان بووە لە کەرکوک، ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو کە مرۆڤی ئەم شارە داهێنانی خۆی هەبووە لە هەموو بوارەکاندا، هەر چەندە تەنها ڕەقیمە قوڕییەکانی بواری ئابووری‌و خێزان‌و کۆمەڵگەی ئەو کاتەو بازرگانی تێدا بە جێماوە، بەڵام لە کنەو پشکنینی دوارۆژ گەلێک بەرهەم‌و داهێنانی بوارەکانی تریش دەدۆزرێتەوە، چونکە ئیمبراتۆرییەتێکی وا گەورە ڕێی تێناچێت کە داهێنان‌و شارستانییەتیان لە هەموو بوارەکاندا نەبێت. ئەو ڕەقیمە قوڕییانەی کە لە (نوزی)و (کورو خانی) بۆمان بە جێ ماوە گەواهی توانای نووسین‌و داهێنان‌و ئەو زاراوەییەی کە پێی نووسراوە دەخەنە ڕوو، چونکە دۆزینەوەی ئەو ڕەقیمە زۆرەی قوڕین بەڵگەی توانایی کەسەکانی ئەو ناوچەیە بووە لە توانی سەردەمە زمانەوانییەکانی ئەو کاتە، دۆزینەوەی ئەو ڕێژە زۆرە توانای گەورەیی شارستانییەتییەکە دەخاتە ڕوو کە چەندێک بایەخیان داوە بە تێگەیشتن‌و دامەزراندنی دەزگا کارگێڕییەکانیان.

**دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان**
**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**
**2023**